# مولازم تەحسین و شتی تریش...

فەرهاد پیربالٚ

نۆڤلێت

MULAZIM TAH-
SIN...

RECIT DE FERHAD PIRBAL

نۆڤلێتی (مولازم تەحسین و شتی تریش..)
فەرهاد پیربالٚ (
یەکەم سکێچ: کۆپنهاگن- ١٩٨٧؛ دووەم سکێچ:
پاریس:-١٩٩١، دارِشتنەوەی دیماهی: هەولێر- ٢٠٠١.
تایپ ،نەخشەسازی، بەرگ: مالّی شەرەفخانی بەتلیسی..
چاپخانەی  داناز

چاپ و بلاوکردنەوەی: بنکەی گەلاوێژ

## ژیانی رۆژانەی ئەختەر (١)

ئەختەر، پەرداخێک ئاو بە دەستی راستیەوە، بەسەر دەستی چەپیشیەوە پەپوولەیەک؛ هاتە ژوورەوە. دانوشتایەوە، پەرداخە ئاوەکەی دایە دەست مولازم تەحسین. بە پێکەنینەوە گوتی:

– تەحسین.. تەحسین! لە حەوشەکە خەریک بوو لە کووپەکەوە پەرداخێک ئاوت بۆ دەربهێنم؛ ئەم پەپوولەیەت دیوە؟ هات هێدی هێدی لەسەر دەستم هەڵنیشت. دیوتە! پشت باڵەکانی، شین شین!

مولازم تەحسین پەرداخەکەی وەرگرت و تەماشای پەپوولەکەی سەر دەستی چەپی ئەختەری کرد.

ئەختەر نەیدەتوانی دڵخۆشییە لەناکاوەکەی خۆی

## ژیانی شەوانەی ئەختەر (١)

ئەختەر، پەرداخێک ئاو بە دەستی راستیەوە، بەسەر دەستی چەپیشیەوە پەپوولەیەک؛ هاتە ژوورەوە. دانوشتایەوە، پەرداخە ئاوەکەی دایە دەست جوامێر. بە پێکەنینەوە گوتی:

– جوامێر.. جوامێر! لە حەوشەکە خەریک بوو لە کووپەکەوە پەرداخێک ئاوت بۆ دەربهێنم؛ ئەم پەپوولەیەت دیوە؟ هات هێدی هێدی لەسەر دەستم هەڵنیشت. دیوتە! پشت باڵەکانی، شین شین!

جوامێر پەرداخەکەی وەرگرت و تەماشای پەپوولەکەی سەر دەستی چەپی ئەختەری کرد.

ئەختەر نەیدەتوانی دڵخۆشییە لەناکاوەکەی خۆی



بشارێتەوە:

– هەر لە خۆیەوە، دەتگوت فریشتەیەک بوو، لەناو ئەو هەموو گوڵ و گەڵایەی ناو حەوشەکە، هات دەستی منی دۆزییەوە بۆئەوەی لەسەری هەڵبنیشێت. عەینەن وەکو تۆ!

مولازم تەحسین پێکەنی:

– چۆن؟

– چیە، پێت ناخۆشە بە پەپوولەت بچوێنم؟

– نا، بەڵام دەمەوێ بزانم چۆن؟

– تۆ لەم شارە بە قەد صەدام حوسێن دەستت دەڕوا. دەتوانیت دەست لەسەر هەر کچێک دابنێیت و نەڵێت «نا»؛ کەچی لەناو هەموو کچانی ئەم شارە، هاتیت لەسەر دڵی من هەڵنیشتیت.

بشارێتەوە:

– هەر لە خۆیەوە، دەتگوت فریشتەیەک بوو، لەناو ئەو هەموو گوڵ و گەڵایەی ناو حەوشەکە، هات دەستی منی دۆزییەوە بۆئەوەی لەسەری هەڵبنیشێت. عەینەن وەکو تۆ!

جوامێر پێکەنی:

– چۆن؟

– چیە، پێت ناخۆشە بە پەپوولەت بچوێنم؟

– نا، بەڵام دەمەوێ بزانم چۆن؟

– لە هەموو سلێمانی تەنیا یەک «جوامێر» هەیە، ئەویش تۆی. هیچ کچێکی ئەم شارە نیە بە ئازایەتی و کەسایەتییەوە نەتناسێ. هەر چالاکییەکی پێشمەرگانە لەم شارە بکرێت، ئەگەر

مولازم تەحسین گوتی:
– نەوەڵا ، عەینەن خۆت!
ئەختەر پێکەنی:
– چۆن؟
مولازم تەحسین گوتی:
– من عارەبم. بەعسیم، زابط ئەمنێکم. وەک خۆتان پێم دەڵێن «پیسترین زابط ئەمنی ئەم شارەم». تۆی پەپوولە، لەناو ئەم هەموو گەنجە کوردە قۆزانەی شارەکەی خۆت، هاتیت لەسەر دڵی منی «جەللاد»دا هەڵنیشتیت.
ئەختەر، بازووی، تا ژێربالّی ڕووت، لە ملی مولازم تەحسین ئالاند، بە مەکرێکەوە تەماشای چاوی مولازم تەحسینی کرد:

---

تۆش نەتکردبێت – چونکە زۆرتر تۆیان خۆش دەوێ، دەڵێن: «جوامێر بوو». هەر چۆنێک بێ، دەست لەسەر هەر کچێک دابنێیت، ناڵێت «نەء»؛ کەچی لەناو هەموو کچانی ئەم شارە، هاتیت لەسەر دڵی من هەڵنیشتیت. عەینەن پەپوولەکە.
جوامێر گوتی:
– نەوەڵا ، عەینەن خۆت!
ئەختەر پێکەنی:
– چۆن؟
جوامێر گوتی:
– من پێشمەرگەم، هەتا عومرم ماوە هەر دەبێ بەم شاخەوە بم: بێ ماڵ و حاڵ، سەرسەری؛ هەتا هەتایە هەر دەبێ ڕاوی ئەو سەرباز و زابطە پێ



– ئمم! کەواتە ، پەپوولەکە منم؟
مولازم تەحسین دەستی بۆ سمتی خڕ و لووسی ئەختەر درێژ کرد، بە ئاخێزێکی بەپەلە هەڵی لووشییە باوەشی خۆی:
– بەرخ، بەرخ! تۆ بەرخۆڵەی منی! حمممم...
کەوتە لێسانەوەی ئەختەر، ئەختەری کولاوی ناو پێکەنین و ئەو حیتەحیتە هەوەسبازییەی کە هەمیشە لەم حاڵەتانەدا پێی ڕاهاتبوو. لە کۆتاییدا، مەچەک و زەندی پڕ بازنی خۆی لە چنگ مولازم تەحسین دەربازکرد و هەستایەوە. چووە بەر ئاوێنەکە، گوتی:
– تەحسین! تۆ ئەوەی لەگەڵ من دەیکەیت؛ دەتوانیت لەگەڵ هەر ئافرەتێکی دیکەش بیکەیت..

---

پەتییانە بکەم کە بەم شاخ و داخەوەن. مەگەر جاروبار بتوانم، بۆ تەقاندنەوەیەک یان بۆ کوشتنی جاسووسێک، بێمە ناو شار و لایەک لە تۆش بکەمەوە. تۆی پەپوولە، لەناو ئەو هەموو گەنجە کوردە قۆزانەی ئەم شارە، هاتیت لەسەر دڵی منی «بەدبەخت» هەڵنیشتیت.
ئەختەر، بازووی، تا ژێربالّی ڕووت، لە ملی جوامێر ئالاند و بە مەکرێکەوە تەماشای چاوی جوامێری کرد:
– کەواتە ، پەپوولەکە منم؟
جوامێر، بە بێزارییەوە گوتی:
– ئەرێ وەڵا ئەمە کاسبی نیە تۆ کارت هەر ئەوە بێ سەرباز و زابطی ناو شار و شاخ ڕاوبکەیت و

دەزانی؟
مولازم تەحسین تازە جگەرەیەکی داگیرساندبوو:
– بەڵام من، بە گۆڕی باوکم، سوێندت بۆ دەخۆم: لەوەتەی لەم شارە تۆم ناسیوە، دەستم بۆ هیچ ئافرەتێکی دیکە درێژ نەکردووە؛ پاش ناسینی تۆ نەفسم نەچۆتە سەر هیچ ئافرەتێکی دیکە.
لەوکاتەدا مولازم تەحسین ئەوەی بیرهاتەوە کە چۆن مانگێک بەر لە ئەمڕۆ، ژن و هەر سێ کچە عازەبەکەی «حاکم نەریمان نەوڕۆڵی» لەسەر ئەوەی حاکم نەریمان لەم دواییەدا بەیەکجاری پەیوەندیی بە پێشمەرگەوە کردبوو و دابوویە شاخ، پەلکێشی ئەمنە سوورەکەیان کردبوون؛ چۆن لەوێ کچە گەورەکەی حاکم نەریمان لە گۆشەیەکی تەعزییخانەدا

تەپۆلکە گوناحەکانیان بدەیتە بەر گوللە و ئارپیجی. من ویژدانم لە هەموو ئەو کاتانەدا پێم دەڵێ: «تۆ جەللادیت». پاشان، کەی ئەمە ژیانە پێشمەرگە هەیەتی؟ هەموو ژیانمان، وەک مرۆڤی نیاندرتاڵ، لەناو شاخ و تەلان و ئەشکەوتان! پیاوی وامان لەگەڵدایە حەوت ساڵ زیاترە چاوی بە ژنێک نەکەوتووە.
جوامێر لەوکاتەدا ئەوەی بیرهاتەوە کە چۆن، ئەو وەختەی لە گوندی «بەرداوا» بوون، «مامۆستا حەیدەر فەیلی» لەودیو بارەگاکەی خۆیانەوە، لەناو پێشەلانە ڕەنگین و فێنکەکەدا– کە کەوتبووە ناو دۆڵەکە– لە پەنادیواری ئەو خانووەی کە کردبوویان بە مزگەوت و نوێژیان تێدا دەکرد، هەر چوار پەلی



لێی پاڕایەوە و گوتی: «مولازم تەحسین، تۆ بەتەنیا خۆت، چیم لەگەڵ دەکەی بیکە: تەنیا مەهێڵە فەرمانبەرەکانی دیکەت لەوە زیاتر ئازارمان بدەن!»؛ چۆن لەو کاتەشدا مولازم تەحسین تێگەیشت کە فەرمانبەرەکانی دیکەی ناو ئەمنە سوورەکە، لە کاتی ئازارداندا بەزۆرەملێ ژن و هەر سێ کچە عازەبەکەی حاکم نەریمانیان ئەتک کردووە؛ خۆ ئەویش دەیتوانی هەمان کردەوەیان لەگەڵ دووپات بکاتەوە، بەڵام نەیکرد!
مولازم تەحسین بەپێویستی نەزانی ئەم هەڵوێست و ڕووداوە بۆ ئەختەر بگێڕێتەوە، چونکە دەیزانی: ئەختەر پێویستی بەم جۆرە بەڵگە و بەم جۆرە حەکایەتانە نیە؛ ئەختەر بەتەواوەتی لەوە دڵنیایە کە

جوانووەکەی «مام ڕەقیبی نانهێن»ی بەستبۆوە؛ تەنەکەیەکی بەرزیشی لەژێر پێی خۆی دانابوو، کەوتبووە سەر کەفەڵی جوانووەکە؛ هەروەها چۆن پاشان مام ڕەقیبی نانهێن، کاتێ چاوی بەم دیمەنە دەکەوێت، یەکسەر شاڵاوی بۆ دەبات و لێی تێکدەدات و دەبێتە هەرایان؛ چۆنیش پاشان مام ڕەقیبی نانهێن لە دادگای شۆڕشی ناو گوندەکە، شکایەتی لە مامۆستا حەیدەر فەیلی کردبوو لەسەر ئەوەی کە چۆن دەبێ مامۆستا حەیدەرێکی پێشمەرگە بچێ جوانووی خەڵکی هەژاری لادێ بخاتە ژێر حەملەی... خۆیەوە!؟).
جوامێر، لەکاتێکدا ئەم ڕووداوەی بیرهاتەوە، زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوی و بیرۆکەیەک دڵی

چەندی خۆش دەوێت! ڕۆژێکیان مولازم تەحسین بەڕاستگۆییەوە پێی گوت:
– ئەختەر، گوێ بگرە! خۆ من دەتوانم بەزۆرەملێ بتخەمە پشتی ئۆتومبیلەکەمەوە و تا بەغدا ڕانەوەستێن، بەزۆرەملێ بتکەم بە ژنی خۆم؛ بەڵام من هێندەم خۆش دەوێیت کە نامەوێ غەدرت لێ بکەم و تۆزقاڵێک چیە ئازارت بدەم.. حەزدەکەم تۆ خۆت بە خواستی خۆت و بە بڕیاری خۆت بەگەڵم بکەویت!
ئەختەر لەو کاتەدا سەروقژی خۆی بەدیار ئاوێنەکەوە ڕێکدەخست؛ نەرم نەرم دەیویست دڵی ئەو ڕازی بکات:
– تەحسین، منیش، باوەڕەم پێ بکە، هەر کە تۆ

ڕنەک دا: «ژیانی پێشمەرگایەتی، ئەگەر بە قسەی فرۆید بووایە، دەبووە گرنگترین سەرچاوەکانی داهێنان؛ چونکە هەموو ژیانی پێشمەرگایەتی، هەمیشە، لێوانلێوە لە کەپتی سێکسی». ئنجا ڕووی قسەی کردە ئەختەر:
– ئەرێ وەڵا، پێشمەرگەی بەستەزمان، هەر هەموویان، بە خۆشمەوە، لەوێ، وەختە شێت بێن بۆ «ژنێک»!
ئەختەر پێکەنی، پاشان سەری بسکی خۆی لە لادەمی خۆی نا و بە نازێکەوە ورتە ورتێکی کرد:
– کەواتە، جوامێر، بەڕاستی، تۆ تەنیا منت هەیە!
جوامێر هەناسەیەکی حەسانەوەی هەڵکێشا،



دەگەیتە لام، ئیتر وام لێ دێ بێز لە خۆم دەکەمەوە کاتێ بیر لەوە دەکەمەوە کە من بۆ سبەینەکەی یان دوو سبەی دەچم لە باوەشی پیاوێکی دیکەدا خۆم دەدۆزمەوە. بەڕاستی.
ئەختەر کە ئاوڕی دایەوە، مولازم تەحسین هەستابۆوە سەر پێ؛ لە ناوک بەرەو خوارەوەی خۆی لە سمتی ئەختەر توند کردبوو، لەدوواوەڕا ددانی جیر کردبۆوە؛ تووڕە، هەر دوو شانی ئەختەری بۆ لای خۆی ڕاتەکاند:
– ئەدی بۆچی شووم پێ ناکەی.. هەی ئیبلیس؟
ئەختەر ختووکەی هاتەوە و لە هەمان کاتدا هەستی بە ئازارێکی پڕ لە چێژیش کرد:
– چی؟!

دەستی خستە سەر کڵاشنکۆفەکەی تەنشتی:
– ئەویش جار بە جار.. لە مانگێدا شەوێک.
ئەختەر پێکەنی، گوتی:
– پێشمەرگە دەبێ سوپاسی خوا بکا ئەگەر ئەوەندەشی هەیە.
– چۆن؟
ئەختەر نازی بەسەر جوامێرەوە دەکرد:
– مەبەستم ئەوەیە کە دەتوانێ جار بە جار لەگەڵ ژنێکی جوانی وەک من چەند ساتێکی خۆش بەسەر ببات.
جوامێر گوتی:
– بەڵام هەموو پێشمەرگەیەکیش ئەو جەربەزەییە ناکات هەفتەی جارێک یان مانگی جارێک، بە

مولازم تەحسین دەتگوت دەیەوێ بیخوا:
– شووم پێ بکە.. شووم پێ بکە، هەی ئیبلیس!
ئەختەر سەری داخستبوو، تەماشای پەرداخە بەتاڵەکەی دەکرد؛ لەناکاو دەستی مولازم تەحسینی لەسەر شانەکانی خۆی هێنا خوارەوە و بە تریقەی پێکەنینێکی فریشتەییانەوە ڕایکردە دەرەوە:
– دەچم وێسکی و مەززەکانت بۆ دەهێنم.

مولازم تەحسین، لە ژوورەکەوە هاواری لێکردە دەرەوە:
– ملوانکەیەکی زێڕینی تازەم بۆ کڕیوی... حەیوان!

نیوەی شەو، لەو شاخانەوە دابەزێتە ناو شار بۆئەوەی «خۆشەویستەکەی» ببینێت!
– دەزانم.
ئەختەر بە مەکرەوە دەستی کردە ملی:
– ئەمە تەنیا هونەری تۆیە.
جوامێر ڕووی کردە ئەو:
– تۆ هەمیشە ناو لەم چیرۆکەی ئێمە دەنێیت «هونەر»، «سەردان»، «وێران».. قەت بە زمانتدا نایە بڵێیی «عەشق».
– چی!؟ عەشق؟ کە وا نیە!
– ئەختەر، گوێ بگرە: من خۆشم دەوێیی..!
ئەختەر، تووڕە، دەستی دایە پەرداخە ئاوە بەتاڵەکە و هەستایەوە؛ هەر دوو دەستی لە ناو



قەدی خۆی گرت:
– ئەدی بۆچی نامخوازی؟ بۆ نامخوازی.. هەی ترسنۆک!
ئەختەر بە هەنگاوی زۆر تووڕە کەوتە ناو حەوشە تاریکەکەوە. دیار بوو چوو بڕوا وێسکی و مەززەکان بۆ جوامێر بهێنێت و لەسەر مێزێک ئامادەیان بکات.

جوامێر، لە ژوورەکەوە، هاواری لێکردە دەرەوە:
– گۆرەوییەکانت بۆ چنیوم، ئەختەر گیان؟

## ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر (٢)

ئەختەر بۆ جوامێری دەگێڕایەوە:

– دەمەوعەسرانێکی پاییز بوو، کاتی ئینتیخاباتەکەی مەجلیسی تەشریعی و تەنفیزی بوو، شار قڵیشابۆوە.. قومبەلەیەک لە بەردەم مزگەوتی گەورە تەقابۆوە؛ چوار کەسی کوشتبوو، یازدە کەسیش بریندار بوون. بە بیرتە؟

– بە بیرمە. ئەو ڕۆژە بوو کە پێشمەرگە «عادلی مونەززەمە»یان بریندار کردبوو.

– لە خەتی شارباژێڕەوە هاتبوونە ناو شار.

– «ئارامی عەبەی دەڵلاک» و هاوڕێکانی بوون.

– خەڵک دەیانگوت: «حکوومەت خۆی

## ژیانی شەوانەی ئەختەر (٢)

ئەختەر، کە بە هیچ شێوەیەک نەیدەوێرا ناوی جوامێر لە لای مولازم تەحسین بهێنێت؛ بە هەمان شێوە نەیدەتوانی ئەم چیرۆکە بۆ مولازم تەحسین بگێڕێتەوە:

نیوەڕۆیەکی گەرمی هاوین بوو. ئەختەر کاغەزێکی بەدەستەوە بوو کە بریتی بوو لە فەرمانێکی وەزاری بۆ تەعین بوونی ئەختەر لە بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵی سلێمانی؛ لە دەرگای نووسینگەکەی جوامێری دا.

– فەرموو!

ئەختەر لە کورسی و مێزەکەی جوامێر نزیک



بەئانقەست ئەو قومبەلانەی لەوێ داناوەتەوە بۆئەوەی سومعەی پێشمەرگە لەککەدار بکات».

– حکوومەتیش دەیگوت: «یاخیبووە چەکدارە بەکرێگیراوەکانن».

– قومبەلەیەکی دیکەش فڕێ درابووە ناو مەعمەلی جگەرەکە و هەژدە کەسی کوشتبوو. تازەش، دوو سێ ڕۆژێک بوو «ئاکۆ ئارپیجی» و تیپە فیدائییەکەی، دەزگیر کرابوون کە چووبوون پارێزگاری کەرکووک «تیرۆر» بکەن.

– بەبیرمە.

– مولازم تەحسین، وەک گورگی بریندار، بە خۆی و هەشت موسەللەحەی پڕ قووات خاصە، بەناو کۆڵانەکانی شاردا دەسووڕایەوە. تۆ لە شاخەوە،

کەوتەوە:

– جەنابی بەڕێوەبەر..؟

جوامێر، گەنجێکی جوانی کەشخەی چوارشانە، سمێڵ کەش؛ دڵی کەوتە جونبوشەوە:

– بەڵێ، فەرموو!

– من ناوم «ئەختەر قادر»ە، کە پێشتر بەیان حاجەتان بۆ نووسیبووم. ئێستا فەرمانی تەعین بوونەکەم لە لای ئێوە بۆ دەرچووە.

– بەڵێ..

– هاتووم دەوام بکەم.

جوامێر، کە پێشتریش جارێک بینیبووی، لەبەری هەستایەوە؛ تەوقەیەکی لەگەڵدا کرد:

– بەخێر بێیت.

تەنیا دوو سێ رۆژێک بوو، پڕ بە قەد چوار تەنەکە، بەیاننامە و مەنشووراتی حزبت بۆم ناردبوو کە بەناو شاردا بڵاویان بکەمەوە.

– لەبیرمە.

– باش بوو یەک دانەشی لە ماڵەوە نەمابوو؛ هەمووم بڵاوکردبوونەوە. بەبیرمە: ئەو عەسرە، خوشکەزاکەم، لەناکاو، بەپرتاو، خۆی کوتایە ژوورەوە و هاواری کرد:

– دادە ئەختەر؛ مولازم تەحسین..!

زەندەقم چوو، هاوارم کرد: چی؟!

– مولازم تەحسین... لە گەڕەکایە.

– نا!؟

– ماڵ بە ماڵ دەگەڕێ.

– ئەیەرۆ..!

– تەفتیشاتە.

ئەختەر بۆ جوامێری دەگێڕایەوە:

– ئەو رۆژە، لە بەیانییەوە تا دەمەوعەسران، دەیانگوت: سێ صەد گەنجی زیاتری ئەم سلێمانییەی قۆڵبەست کردووە و بردوونیەتە ئەمنە سوورەکە.

– کوڕە گەورەکەی ئەم «عەلی پەڕەشووتە»شیان لەگەڵدا بوو، کە ئێستا دراوسێتن.

ئەختەر گوتی:

– ئەو دەمەوعەسرە پاییزییە بوو کە من مولازم تەحسینم تێدا ناسی.

جوامێر پێنووسەکەی لەسەر کاغەزەکەی بەردەم خۆی دانا و دۆسییەکانی بەردەم خۆی بەجێهێشت:

– با بچین نووسینگەکەی خۆتت پیشان بدەم و هاوکارەکانی خۆتت لە بەشی (صادرات) پێ بناسێنم. لە سبەینێ بەملاوەش وەرە دەوام بکە!

ئەمە کەی بوو؟ سێ ساڵ پێش ئێستا، پێش ئەوەی هێشتا جوامێر «کەشف» ببێت و ناچاربێ شار بەجێ بێڵێت و پەیوەندی بە پێشمەرگەکانی ناو شاخەوە بکات.

جوامێر هەر لەوکاتەوە کادرێکی گەورەی حزب بوو، بەرپرسی یەکەمی هەموو شانە نهێنییەکانی ناو شار بوو. بۆ داپۆشینی ئەم مەسەلەیەش، خۆی کردبوو بە «بەعسی»؛ رەفیق حزبی بوو. هەموو خەڵک، ئەوانەی جوامێریان خۆش دەویست و رێزیان لێی دەگرت، بەنهێنی، لەنێو خۆیاندا، دەیانگوت: «.. بەڵام حەیف؛ ئەو پیاوە چاکە؛ بەعسییە».

جوامێر، «خەت مایل»، رەفیق حیزبی لەناو حزبی بەعسدا؛ بەڵام لەژێرەوە بۆ پێشمەرگە کاری دەکرد. تەنانەت هەموو مەنشووراتەکانیش، کە لە شاخەوە هەفتەی جارێک پێی دەگەیشتن، بەیانیان، هەر خۆی، بەدەستی خۆی بەناو بەرێوەبەرایەتییەکەی خۆیدا بڵاوی دەکردنەوە.

جوامێر دوو مانگ زیاتر بوو، چەندی دەیکرد و دەیکرد، نەیدەتوانی ئەختەر فریو بدات و رۆحکێشی ماڵەکەی خۆی بکات لە (عەقاری). رۆژێکیان،

- چۆن؟
- لە ماڵەوە دانیشتبووم. هەر یەکسەر، دووای هاواری خوشکەزاکەم، زۆر بەتوندی، - پێم وابێ بە پێلەقە بوو، مولازم تەحسین لە دەرگای دا. من ڕۆحم لەگەڵی لەرزی. وەیش! زانیم ئەوە! بەتاقی تەنیا لەناو ماڵەکە؛ چی بکەم؟ پاشان بۆم دەرکەوت «ست نیهایەتی بەڕازیلییەکە» خەبەری لێ دابووم. بەپەلەپڕووزێ چووم دەرگاکەی لێ بکەمەوە. هێشتا دەستم نەگەیاندبووە مشتووی دەرگاکە؛ ئەو لەودیوەوە، بە پێلەقەی دووەم، دەرگاکەی خستە سەر گازارەی پشت. چوار پێنج عەسکەر، دەست بە کلاشنکۆفەوە، لە پشتەوەی راوەستابوون. بێ ئەوەی هێشتا کەسی دیبێ، هاواری کرد:

ئەختەر بۆ خۆیشی نازانێت چۆن بوو، گوتی: «باش»؛ بەگەڵی کەوت. ئیتر لەو رۆژەوە بوو کە وردە وردە ناوی «ئەختەر» لکایە ناوی جوامێرەوە. لەناو دائیرەی کشتوکاڵی سلێمانیدا هەر فەرمانبەرە و قسەیەکی دەکرد. کوڕەکەی «کەریم کەردز» کە ژمێریاری دائیرە بوو، دەیگوت:
- «ئەختەری قادر قوتوو» بۆتە دۆستی مودیر؛ ئیتر مەڕحەبا لە کەس ناکا.
کچە هاوکارەکەی خۆیشی، لە هەمان بەشی صادراتدا، لای ئافرەتەکانی تر دەیگوت:
- هەر بۆ بەرژەوەندیی خۆیەتی.
«سەلامی فەڕەج فافۆن» کە هاوڕێی نزیکی جوامێریش بوو، لای برادەرەکانی خۆی دەیگوت:



- عدکم پێشمەرگە بالبیت. کە هاتە ژوورەوە و منی دیت، یەکسەڵەف، لەخۆیەوە، ئەهوەن بوویەوە:
- لازم نفتش البیت!
من، فۆتەیەکی گوڵگوڵیم بەسەر شانەکانی ڕۆبەکەم دادابوو، گوتم:
- فەرموون!
شیڕاندی:
- کێ لەم ماڵەیە؟
دەمویست زوو بڕوات و لە کۆڵم بێتەوە، گوتم:
- حورمەم؛ بەتاقی تەنیام.
گوتی:
- کوڕت، کچت، مێردت..؟!
گوتم: کەسم نیە؛ بەتەنیام.

- جوامێر تەنیا دەستی پێ گەرم دەکاتەوە. من دەزانم.
ئەوانەی ڕۆشنبیریش بوون و بە چاوێکی سیاسیانە دەیانڕوانیە دنیا، دەیانگوت:
- جوامێرەفەندی تەنیا بۆ ئەوەیەتی کە بیکاتە حزبی و هیچی تر نیە.
پڕ و پیرەژنە فەڕاش و پاسەوان و چایچی و فەرمانبەرەکانیش دەیانگوت:
- ڕەببی پیرۆزی یەکتر بن؛ ئەمجا بە خوا جوان لەیەکتری هاتوون!
ئەختەر بیریەتی: «باجی بەهێ»ی ژنەفەڕاشەکە، هەموو جار کە دەهات پەرداخە ئاوێکی دەدایە دەستی، پێی دەگوت:

ئاوڕێکی لە قووات خاصەکانی پشتەخۆی دایەوە، پێی گوتن:

– ئێوە، کەستان نەیەنە ژوورەوە؛ من بەتەنیا تەفتیشی ئەم ماڵە دەکەم.

دەمانچەی ڕووت بەدەستییەوە، تەماشایەکی چیمەنە پڕ پەپوولە و گوڵزارەکەمی کرد. پاشان بەسەر پێپلکەکان کەوت، لەناو حەوشەکەدا بەگومانەوە لێمی پرسی:

– تۆ بۆچی بەتەنیای لەم ماڵە؟

هەستم کرد بەلایەوە گرنگ نەبێ وەڵامی من ببیستێ؛ سەری بەناو ئەم ژوورەدا هێنایە ژوورێ؛ پاشان چوو تەماشایەکی ژوورەکەی دیکەیشی کرد و پرسیارەکەی دووبارە کردەوە:

---

– بەقوربانت بم، نۆشی گیانت بێ؛ دەڵێی «کچی کافرۆش»یت؛ ڕەببی پیرۆزی مودیر گیان بیت..!

چیرۆکی خۆشەویستیی جوامێر و ئەختەر بۆ ماوەیەک هەر بەم شێوەیە مایەوە. بەڵام ئەختەر هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە، بڕیاری دابوو؛ بەتەواوەتیش دڵنیا بوو کە ئیتر دەبێتە ژنی جوامێر! تا ئێسقانی لەوە دڵنیا بوو کە جوامێر دەیخوازێت! ئەختەر لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەگەر بەڕاستی خۆشی نەوێم و متمانەم پێ نەکات، چۆن نهێنیی ئەوەم لەلا دەدرکێنێت کە ئەگەرچی ڕەفیق حیزبیە و لەناو حزبی بەعسدا کاردەکات؛ بەڵام خەت مایلە و خەباتی نهێنی لەپێناو نیشتماندا دەکات؟ چۆن ئەوەم لەلا دەدرکێنێت کە سەر بە پێشمەرگەیە! ئەگەر بەڕاستی



– پێم بڵێ!

من ئیتر کە زانیم ڕێز لە حورمەییم و بەتەنیابوونم لەناو ماڵەکەدا ناگرێ، بیرم کردەوە کە ئیتر پێویستە بتوانم بزانم چۆن وەڵامی بدەمەوە و خۆمی لەدەست قوتار بکەم. بێباکانە لەوەی بترسم هیچ گومانێکی سیاسیم لێ بکات، گوتم:

– ئەم شارە سەدان ژنی وەکو منی تێدایە کە بەتەنیان.

– ژنەپێشمەرگە و ژنەشەهید.. وا نیە؟

گوتم:

– ژنی وەکو منیش..

ئەم قسەیەم لەوە دەچوو گومانی لە دڵ کەمتر کردبێتەوە:

---

خۆشی نەوێم و متمانەم پێ نەکات، چۆن منیش لەگەڵ خۆیدا دەخزێنێتە ناو هەمان شانەی ڕێکخراوی نهێنیی شاخەوە و چارەنووسی من بە چارەنووسی خۆیەوە گرێ دەدات؟ چۆن دەیەوێ بمکاتە بەرپرسی شانەکانی ڕێکخراوی نهێنیی ئافرەتانی ناو شار و پلەی بەرزی حزبیم پێ ببەخشێ؟!».

– جوامێر یەکەمین پیاو بوو کە من خۆمم بۆی ڕووت کردەوە.

ئەختەر هەموو جار وای بە «باجی بناری ژنی مامەندە مۆن» دەگوت. باجی بناریش پێی دەگوت:

– پەشیمان نیت، ئەختەر؟

ئەختەر دەیگوت:

– مێردت لەکوێیە؟
درۆم کرد، گوتم:
– وەفاتی کردووە.
– منداڵت نیە؟
– نەخێر.
– یەعنی لەم ماڵەدا بەتەنیا دەژیت؟ هەر خۆت؟
– جاربەجار خوشکەزاکانم دێنە لام.
کە گەیشتەوە چیمەنەکە، هەر دەتگوت ماڵەبابی خۆیەتی: لەناو چیمەنەکە، لەسەر کورسییەکەی ئەوێ دانیشت؛ دەمانچەکەی خستەوە ناو کیفی لاکەلەکەی، هەر دوو قاچی خۆی بەرامبەرم درێژ کرد:
– تۆ کێ دەتژیەنێت؟
– ئەی خۆم چیم؟

– نەخێر، چونکە خۆشیم ویست؛ خۆشی ویستم.
«باجی بناری مامەندە مۆن» دەیگوت:
– ئەدی ئێستا؟ ئێستا پەشیمان نیت؟
– نەخێر.
باجی بنار دەیگوت:
– هەی کەرە! ئاخر ئەو بوو کە تۆی بەم رۆژە گەیاند.
ئەختەر درۆی لەگەڵ باجی بنار نەدەکرد؛ دڵۆپە فرمێسکە گەرم و ڕوونەکانی خۆی دەسڕییەوە و دەیگوت:
– ئێستاش هەر خۆشیم دەوێ.
باجی بناری مامەندە مۆن زوو زوو حەزی دەکرد ئەو برینە قووڵەی رۆحی ئەختەر بکولێنێتەوە:



دەمێک بوو بە وەڵامەکانی من تووشی سەرسوڕمان هاتبوو. گوتی:
– تۆ چ کارەیت؟
گوتم:
– جل دەچنم و خەیاتی دەکەم.
– خوا تەمەندرێژت بکا!
گوتم:
– چایەکت بۆ لێ نێم؟
چاوم لێ بوو: تەماشای گوڵەکانی سەر عەردی کراسەکەمی دەکرد، گوتی:
– تەنیا پەرداخێک ئاو.
کە ئاوەکەم دایە دەستی، دیسان گوتی:
– خوا تەمەن درێژت بکا!

– باشە.. لەبەرچی؟ ئێوە بۆچی ئاوها لێک دابڕان؟
– جوامێر کاتێ کەشف بوو کە لەگەڵ ڕێکخراوی پێشمەرگاندایە، ئیتر دەبوایە دائیرە و وەزیفەکەی خۆی بەجێ بێڵێ؛ گوتی: «ئەختەر، تەواو! من دەبێ بڕۆم و بەجێت بێڵم».
– ئێ؟! دە فەرموو!
– گوتم: «جوامێر، من بوومەتە ژن. من ئێستا ژنی تۆم».
– هەموو خەڵک و هەموو دائیرەکەشتان دەیاتزانی کە جوامێر تۆی کردۆتە ژن!
– گوتم: «دەبێ لەگەڵ خۆت ببەیت!».
– وەیش..!

ئەختەر بە جوامێری نەگوت:
– مولازم تەحسین پیاوێکی قۆزی کەڵەگەتی چاو
و برۆ جوانی کەشخە بوو.
هەروەها پێیشی نەگوت:
– لەو دەمەدا، کە لەناو چیمەنەکەدا دانیشت؛ دەم
و دەست حەزم دەکرد بیکەمە موشتەریی بەردەوامی
خۆم.
ئەختەر بە جوامێری گوت:
– ئەو ناجسنە خوێڕییە، دەتگوت کوللەڕەشە
گەورەکانی کەربەلایە.
هەروەها گوتی:
– لەناو چیمەنەکەدا، هەر دوو قاچی بەرامبەرم

---

– گوتی: « ناکرێ. تۆ هیچ نەبێ جارێ ماوەیەک
لەناو شاردا بمێنەوە».
– بۆ مولازم تەحسین... بۆ مولازم تەحسین
بمێنیتەوە! هەی چاوی کوێر بێ! بۆ مولازم تەحسین
بمێنیتەوە!

ئەختەر، هەمیشە چاو بە گریانەوە بۆ باجی بنار
دەکرووزایەوە:
– ئیتر «ماوەیەک» بووە مانگێک، بووە شەش
مانگ، بووە ساڵێک، بووە دوو ساڵ و.. تا ئێستا.
– ڕۆڵە گیان، تۆ ئەوساتیش، ئەگەر هەتیو
نەبوویتایە، ئەگەر باوکت یان برایەکت هەبووایە
پشت و پەنات بووایە: ئەویش نەیدەتوانی ئاوها بە



ڕاکێشابوو؛ نە شەرم نە حەیا: بە نیگا
حەشەرییەکانی بەژن و باڵامی دەلستەوە.
ئەختەر بە جوامێری نەگوت:
– دووای ئەوە ئیتر منیش یەکسەر کورسییەکم
ڕاکێشایە ناو چیمەنەکە و بەرامبەری دانیشتم.
ئەختەر بە جوامێری گوت:
– من هەر بەپێوە وەستابووم، زەندەقم چووبوو،
خوا خوام بوو بڕوات و لەکۆڵم بێتەوە؛ کەچی گوتی:
«ڕوخسەتم دەدەیتێ کە ئەم شەو دیسان بێم
تەفتیشی ماڵەکەت بکەمەوە؟».
ئەختەر بە جوامێری نەگوت:
– گوتم: «بەڵێ، هەر وەختێک هاتیت، بەسەر
چاو؛ ماڵی خۆتە!».

---

ناوی پێشمەرگایەتی و حزب و کوردایەتییەوە
پشتت تێ بکات و بەجێت بهێڵێ.
– خاڵەگەورەکەم زۆر خۆشی دەویستم. دوو سێ
جاران نامەی بۆ جوامێر نارد. جارێکیش چووە لای،
بۆ شاخ.
– سوودی نەبوو، ها؟
– ئیتر خاڵەکەشم پشتی تێکردم؛ گوتی:
«سووچی خۆتە».
باجی بناری ژنی مامەندە مۆن، ژنێکی دەم بە
هاوار، هەموو جار لە کاتی گێڕانەوەی ئەم
حەکایەتەدا، بۆ دڵدانەوە و خستنە پێکەنین، بە
ئەختەری دەگوت:
– ئاوها ئیتر؛ وردە وردە، تەماشات کرد: خۆت و

ئەختەر بە جوامێری گوت:

– دەزانی چۆن وەڵامی ئەو بەعسییە خوێڕییەم دایەوە؟ پێم گوت: «نەخێر. ئێمە کوردین؛ عورف و عادەتی کوردان ڕێگە بەوە نادات ژنێکی تەنیا بە شەوان دەرگا لە پیاو بکاتەوە».

ئەختەر بە جوامێری نەگوت:

– شەو، پێش ئەوەی ئەو بێت، چووم حەمامێکم کرد و مێخەکبەندەکەم بۆی لە مل کرد و خۆم چووم دەرگاکەم لێی کردەوە.

ئەختەر بە جوامێری گوت:

– ئەو تەرەسە خوێڕییە، شەو، بە خۆی و ئوتومبیلەکەیەوە، دیسان، لە دەرگای دایەوە.

ئەختەر بە جوامێری نەگوت:

قوزی خۆت ماونەتەوە.

ئەختەر قەیرێک بە قسە قۆڕەکانی باجی بنار پێدەکەنی؛ پاشان دیسان، لە ناوەندی قسە و باسی دیکەدا دەهاتەوە سەر باسی جوامێر:

– کە جوامێر ڕۆیشت، ڕۆژێک لە ئەمنە سوورەکە بانگیان کردم.

– توخوووا؟

– گوتیان: «یان ئەوەتا دانی پێدا دەنێیت کە تۆش لە هەمان ڕێکخراوی جوامێر کاردەکەیت؛ یان ئەوەتا دەبێ...

– دەبێ چی؟

– دەبێ دەرپێت داکەنیت..!».

– ئەیەڕۆ!



– لەو ڕۆژەوە بوو کە ئیتر بەیەکتر فێر بووین.

ئەختەر بە جوامێری گوت:

– لەو ڕۆژەوە بوو کە ئیتر ئەم بەڵایەم تووش هات.

ئەختەر، دڵۆپە فرمێسکێک زایە قولینچکی چاوانییەوە؛ نائومێد، دیسان بە بێهوودەی زانی گلەیی لە جوامێر بکات و پێی بڵێ:

– ئەگەر کاتی خۆی مارەت بکردمایە و لەگەڵ خۆت بتبردایە بۆ شاخ؛ تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشەی ئەمڕۆ نەدەهاتم!

– بەڵێ.

– ناڵێم؟ حەکایەتی تۆ دوور و درێژە، کچم. خەتای خۆت نەبووە.

– هەمان ئەو ڕۆژە، پێش ئەوەی بانگم بکەن؛ چووبوونە ماڵەوە. ماڵەکەمانیان سەراوبن کردبوو. باش بوو: هەرچی بەیاننامە و بڵاوکراوەی کە جوامێر بۆی ناردبوومن بڵاویان بکەمەوە، لە ماڵەوە، لە شوێنێکی تەقەت هەڵمگرتبوون.

– هیچیان نەدۆزیبۆوە.

– بەڵام هەر دەیانگوت کە من لەگەڵ جوامێر لە هەمان ڕێکخراودا کاردەکەم. دەیانگوت: «لێرە ناچیتە دەرەوە تا دانی پێدا نەنێیت کە تۆ لەگەڵ ئەودا هاوخەبات و هاوشانەیت».

– ئەی پاشان؟
ئەختەر، دڵی پڕ، بۆ باجی بناری مامەندە مۆنی
دەگێڕایەوە:
– لە کاتی ئەشکەنجەدا، سێ پیاو بەجارێک لێم
هاتنە ژوورەوە.
– سێ؟
– ئەوەی یەکەمیان گوتی: «ئێمە دەزانین تۆ
ژنیت و جوامێر تۆی کردۆتە ژن».
ئەختەر لە پڕمەی گریانی دا:
– بە نۆبەت، دەهاتن ...
– .. وەیش! یەعنی بەزۆر...!
– بە.. زۆر...
– کوێراییم دایە بۆت؛ ئەختەر گیان!



– هەموو مانگی جارێک بانگیان دەکردمە «ئەمنە
سوورەکە»...
باجی بنار، بە بێز و سووکییەکەوە، تەماشای
ئەختەری دەکرد:
– وەیش... دایکت بمرێ!
ئەختەر دەگریا:
– ئەمە حاڵی من بوو.
– کوێراییم دایە. مەگری!
– دەردی دڵی خۆم لای کێ هەڵڕشتایە؟ کێ بە
فریای من کەوتایە؟
– هیچ بەڵگەیەکیشیان لەسەرت نەبوو، ئەختەر؟
– هیچ.
– ئنجا پاشان لە دائیرەکەشت فەسڵیان کردیت.

– لە.. دا.. ئی.. ڕەش.. فەسڵیان.. کردم...
باجی بناری ژنی مامەندە مۆن هەمیشە بە ئەختەری دەگوت: «تۆ هیچ گوناهت نیە، ئەختەر.»
– من بەبێ ویست و خواستی خۆم، لە ناچاریی خۆمەوە ڕۆژم بە ڕۆژی ئەمڕۆ گەیشت. کە بیری لێ دەکەمەوە دەتگوت خەونێک بوو!
– ئاگر لە عومریان بەربێ، ڕەببی! ئەوانە، ویستوویانە تۆڵەی جوامێر بەم شێوەیە لە تۆی فریشتە بکەنەوە.. زەلیلت بکەن!
ئەختەر، لەبەر جوامێر، دڵی نەدەهات بە باجی بناری مامەندە مۆن بڵێت:
– جوامێر ئەوکاتە، هەمیشە، لە شاخەوە نامەی بۆم دەنارد، دەیگوت: «قەیناکە؛ جارێ تەحەممول



بکە!».
ئەختەر بە باجی بناری مامەندە مۆنی دەگوت:
– جوامێر ئەوکاتە لە شاخ بوو، ئاگای لە من نەبوو؛ هەواڵی منی نەدەزانی.
ئەختەر، بۆئەوەی شەخسیەتی جوامێر نەشێوێنێ، دڵی نەدەهات بە باجی بناری ژنی مامەندە مۆن بڵێت:
– تەنانەت دوواتریش، کار گەیشتە ئەوەی کە جوامێر بۆی نووسیم، گوتی: «قەیناکە، لەگەڵیان کار بکە؛ بۆئەوەی بتوانیت، بە خەتی مایل، لەناو شاردا درێژە بە خەباتی ژێرزەمینی و سیاسیانەی خۆت بدەیت».
ئەختەر بە باجی بناری ژنی مامەندە مۆنی

دەگوت: «تەنیا جوامێر دەیتوانی لەو زەلیلی و سەمەرگییەم رزگار بکات، ئەویش دوور بوو.»
ئەختەر، شەرمی دەکرد، بێ چاو و ڕووانە، بە باجی بناری مامەندە مۆن بڵێت:
– ئاوها ئیتر؛ لەسەر داخوازیی جوامێر: دەرپێ داکەندنی بەردەوامی من، بووە شێوەیەکی خەباتی شۆڕشگێڕانەی ژێرزەمینی. هەر لەبەر خاتری حزب و لەبەر خاتری جوامێر: ژیانی من، هەتا ئێستاش، هەمووی بووە بەردەوام دەرپێ داکەندن».
ئەختەر بە باجی بناری دەگوت:
– من، وەک ئەم میللەتە، بوومەتە قوربانیی هەر دوو لایان: ڕژێم و پێشمەرگە.



## ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر (٣)

ئەختەر ئەو نیوەڕۆیە، وەک دەیان نیوەڕۆی دیکە، دەعوەتی مولازم تەحسینی کردبوو: کفتەی سابوونکەرانیی بۆ لێنابوو.
– بۆتە دۆستی.
– قەحپەی تایبەتی خۆیەتی، ئیتر.
– دەڵێن ئێستا لە ئەو زیاتر ناداتە کەسی دیکە.
– مەسلەحەتە.
– قەحپەیەکی کورد و ئەمنێکی عارەبی بەعسی؛ پیرۆزی یەکتر بن! کورتە و کەژێ، لێک دەهەژێ!
– باشە، ئێستا بۆ خۆی خەیاتی و جلچنی و

## ژیانی شەوانەی ئەختەر (٣)

ئەختەر ئەو شەوە، وەک دەیان شەوی دیکە، دەبووایە دانیشێت ڕاپۆرتی تایبەتی خۆی بنووسێت: بۆئەوەی سبەی شەو، یان دوو سبەی شەو، کاتێ جوامێر دێتە لای، ڕاپۆرتەکە بە جوامێردا بگەیەنێت بە دەزگای کاروباری نهێنییە عەسکەری و سیاسییەکانی حزب لە شاخ.
ئەختەر هەموو جارێک کاتێ دەکەوتە سەر ڕاپۆرت نووسین، دەتگوت تازە بە تازە یەکەمین جاریەتی ڕاپۆرت دەنووسێ. دەترسا.
دووای ئەوەی چوو خۆی دڵنیا کردەوە لەوەی کە دەرگای حەوشە و دەرگای جامخانەکەی بەرحەوشە و

لیفکەچنییەکەشی لەکۆڵ بۆتەوە.
– کەسیش چیتر نانوانێ جارێکی دیکە مەزبەتەی لێ بکات و لە گەڕەک دەری بکا!
– دەڵێن دەیخوازێ.
– نەخێر، گەوادەیی بۆ دەکا.
– ئەدی بەستەزمانە بە چی بژی؟!
– بەڵام ئەختەر تەنیا یەک دۆستی نیە؛ ئەمەیان سەیرە!
– لەگەڵ مەڕ ئاو دەخواتەوە و لەگەڵ گورگیش دەلەوەڕێ.
– کەس لەو ژنە تێناگا!
ئەختەر دەیان قسەی دیکەی لەو بابەتانەی خەڵک لە مێشکیدا دەزرنگانەوە. خەفەتێکی زۆری بە

پەنجەرەکان یەک یەک بە کلۆم و زنجیر داخراون، ئنجا گەڕایەوە ژووری نوستنی خۆی؛ ئەویشی توند کلۆم دا و ئنجا چوو چوار مەشقی بۆی دانیشت: کاغەزێکی سپیی درێژی لەسەر بالیفەکە، لەبەردەم خۆی دانا.
ئەم جارە چی بنووسێ؟ چیان لێ داوا کردبوو؟
لەم ڕۆژانەدا زیاتر لە چل و پێنج ماڵەکوردی خەڵکی سلێمانی، لە سلێمانییەوە چووبوونە بەغدا بۆ سەردانی «هەڤاڵی تێکۆشەر، صەدام حسێن»؛ هەر خێزانێکیش چەندی لە توانا و دەسەڵات بووبێ، بە کیلۆ خشڵ و ئاڵتوونی لەگەڵ خۆی بردبوو بۆئەوەی تەبەروعی بکات بۆ جەنگاوەرەکانی سەنگەری شەڕ دژی «فورسە مەجووسەکانی ئێران».



بیستنی ئەم قسە و قسەڵۆکانە دەخوارد؛ بەڵام چارەی نەبوو: نەیدەزانی چی بکا! نەشیدەزانی ئەم حاڵەی ئەو بەرەو کوێ دەڕوات و بە چی دەگا؟!
ئەختەر ئەوەی دەهێنایەوە پێش چاوی خۆی کە خەڵک لەبارەی مولازم تەحسینەوە دەیانگێڕایەوە؛ دەشیزانی کە ڕاستە:
مولازم تەحسین، لەناو ئوتومبیلێکی ڕەشی قەبەی تازەدا (سێ مسەللەحەی پڕ چەکدار لەدووایەوە) بە شەقامە درێژەکەی تووی مەلیکدا سەردەکەوێ، لە پەنجەرەوە چاو بە سەر شۆستەدا دەگێڕێ، لەناکاو، هەر گەنجێکی کەشخە و باڵابەرزی تەزبیح بەدەست سەرنجی ڕابکێشێت؛ هەر لە خۆیەوە لێی دەکەوێتە گومانەوە، سواری ئوتومبیلەکەی دەکات و پەلپێچی

ئەختەر دەبووایە ڕاپۆرتێکی فراوان لەبارەی ئەم سەردانە بنووسێت و ناوی یەکە یەکەی ئەو خێزانانە – بەتایبەتی پیاوەکانیان – بنووسێت کە ئەو سەردانەیان کردووە و پارە و زێڕیان بەخشیوەتە صەدام حسێن. ئەمەش بەو ئامانجە بوو کە سەرکردایەتیی شۆڕشی شاخ، نامە بۆ هەرە دەوڵەمەندەکانی ئەوانە بنێرێت و داوایان لێ بکات کە بە هەمان شێوە پێویستە پارەیەکی زۆر بۆ سەرکردایەتیی شۆڕشی پێشمەرگەی شاخیش بنێرن، ئەگینا هەتکیان دەکەن و ڕیسوایان دەکەن؛ ناویان دەخەنە ڕیزی ئەو جاش و خائینانەی کە دانراون بکوژرێن!
ئەختەر ئەم شەو، پێش ماوەیەک، لە تەلەفزیۆن،

دەکات بۆ ئەمنە سوورەکە: دووای هەفتەیەک ئەشکەنجەی توند و «تەمبێکاری» ئنجا بەرەڵای دەکەن. ئەمە تەنیا بۆئەوەی گەنجە کوردەکانی دیکەی ناوبازاڕ و «جادەی تووی مەلیک» هەست بە دەسەڵاتی «بەعس» بکەن و نەوێرن تخوونی سیاسەت و کوردایەتی بکەون!

ئەختەر ئەوەی دەهێنایەوە پێش چاوی خۆی کە خەڵک لێیان دەگێڕایەوە؛ دەشیزانی کە ڕاستە:

مولازم تەحسین، زۆربەی شەوان، درەنگ، لەناو مسەللەحەیەکی قەبەی تازەدا دانیشتووە (سێ مسەللەحەی پڕ چەکدار و قووات خاصەی دیکەش بەدووایەوە)؛ لاشەی بە گوللە هەلا هەلابووی

یەکە یەکەی ئەو خەڵک و خێزانانەی سلێمانیی چاو پێ کەوت کە بەڕیزە دەچوون صەدام حسێن ماچ بکەن و تەوقەی لەگەڵ بکەن و دیارییەکانیان پێشکەشی بکەن.

«زێڕە، زێڕە.

«سەرۆکمان زێڕە.

صەدام زێڕە!»

.. بەردەوام لە تەلەفزیۆنەکەوە ئاوازی دەپرژایە سەریان و صەدام حسێنیش پێشوازیی لێدەکردن و دەستی دەگوشین و بەپێکەنینێکی «پڕ بە دەم» دەستی لە مل دەکردن و دەنوشتایەوە هەندێ لە منداڵەکانیشیانی ماچ دەکرد.

باشە، بەڵام ئەختەر، لە هەندێ ماڵی دیاری



پێشمەرگەیەکی شەهیدکراوی ئەم ئێوارەیەش، بە گوریسێکی ئەستوور بەستراوە بە چەمچەی مسەللەحەکەوە، بەسەر بۆدیی مسەللەحەکەوە شۆڕکراوەتەوە و تک تک هێشتا خوێنی وشکەوەنەبووی ئەم ئێوارەیەی لێ دادەچۆڕێ.. بەناو بازاڕ و بەپێش قسمی داخلییەکانی قوتابییانی زانکۆدا دەیگێڕن! ئەمە هەمووی لەپێناو ئەوەی خەڵک و قوتابییانی زانکۆ بزانن کە حزبی بەعس و حکوومەت ئاوها لەو خەڵک و ڕۆشنبیر و قوتابییانە دەکات کە «ڕێگەی هەڵە» دەگرنەبەر و هاوکاریی پێشمەرگە و یاخیبووەکانی شاخ دەکەن! هەموو بۆئەوەی کە خەڵکی شار چاوترسێن بکەن و وایان لێ بکەن بەگەڵ پێشمەرگە و هاوکارەکانیان

خانەدان زیاتر؛ چۆن بتوانێ ئەو هەموو خەڵکە بناسێتەوە و ناوەکانیان تۆمار بکات؟ ماڵی سەعیدی صادق سەقا، ماڵی مەحموودی مەلا مروەت، ماڵی حاکم دلێری هەڵەبجەیی، ماڵی جەمیل بەگی جەواد بەگی جاف، ماڵی فەرەج ئاغای فەرووفرۆش، ماڵی دکتۆر شەوکەتی عەمەلیات، ماڵی زاهیر زەڕەنگەری عەقاری... تەواو؛ هەر ئەوەندەیان دەناسێتەوە و هەر ئەوەندەشی لەبیر ماوە! بەسە!

ئەختەر هەڵسا، چوو دەنگی تەلەفزیۆنەکەی کزتر کرد؛ چونکە هەمیشە، سڵی لەو مۆسیقایە دەکردەوە کە لەگەڵ دیمەنە خوێناوییەکانی جەنگ دەخرایە سەر؛ پاشان لەناکاو کزەی لە جەرگ هەستا:

نەکەون!
ئەختەر کاتێ ئەم دیمەنە خوێناوییانەی مولازم
تەحسینی دەهاتەوە پێش چاو، هەستی دەکرد
بەڕاستی کە جوامێر لەچاو ئەودا «پەپوولەیەکە» و
شایستەی ئەوەیە تەنانەت تا مردنیش چاوەڕوانی
بکات! چاوەڕوانیشی دەکا. بۆ نا؟

ئەختەر کاتێ ئەم دیمەنە خوێناوییانەی مولازم
تەحسینی دەهاتەوە پێش چاو، هەستی دەکرد،
بەڕاستی، ئەم پیاوە عارەبە بەعسییە، کە تا سەر
ئێسقانی تینووی خوێنی خەڵکی کوردە؛ نەک هەر
شایستەی ئەوە نیە خۆشیت بوێت و شووی پێ
بکەی، بەڵکو پێویستە لە «بەردەرکی سەرا» بەبەر

– وەیش..!
خۆیشی نازانێ بۆچی، لەو دەمەدا، لەناکاو، ئەو
پیرەژنە بەستەزمانەی بیرهاتەوە کە پێرێ چووبوو بۆ
ماڵیان، دایکی «شەهید شوان»! کاتێ پەنجا
دینارەکەی لێ وەرگرت، چۆن دەستەودوعا، نیو
سەعات زیاتر هەر دوعای بۆ کرد و لە خوای گەورە
پاڕایەوە کە بێوەی بکات و لە شەڕ و بەڵای دنیا
بەدووری ڕابگرێ! ئەو دایکە شەهیدە، ئەو پیرەژنە
بەستەزمانە، وایدەزانی ئەختەر – خۆی ئەم پەنجا
دینارەی لە ڕاهی خوا پێ بەخشیوە، نەیدەزانی کە
پێشمەرگە و حزب لە شاخەوە، بۆ لەبیرنەکردنی
خۆبەختکردنی کوڕە شەهیدەکەی، بۆیان ناردووە!
ئەختەر دوو سێ جارانیش هاتە سەر زمانی، کە پێی



چاوی هەموو خەڵکی سلێمانییەوە هەڵبواسرێت و
لەسێدارە بدرێت!

ئەختەر ئەو نیوەڕۆیە، وەک دەیان نیوەڕۆی دیکە،
دەعوەتی مولازم تەحسینی کردبوو: کفتەی
سابوونکەرانیی بۆ لێنابوو.

بڵێت: «ئەم پارەیە خێری من نیە: پاداشت و
یارمەتیی برادەرەکانی شەهید شوانە، بۆیان
ناردووی»، بەڵام نەیدەتوانی لە فەرمایشتی حزب
دەربچێت؛ نەوەکا پیرەژن لە دەمی دەربچێت و لەملا
و لەولا باسی بکات و ئەختەر کەشف ببێت! ئیتر
ئەختەریش لەترسی ئەمە دانی بەخۆیدا گرت و
هیچی نەدرکاند. هەر چۆنێک بێ ئەختەر کاتێ ئەم
دیمەنە پڕ خێر و ئاسوودەییەی دەهێنایە پێش چاوی
خۆی، کاتێ دەیزانی بەڕاستی سوودێکی کەمی بۆ
ئەو خەڵکە لێقەوماوانەی شارەکەی خۆی هەیە؛
زیاتر باوەڕی بەوە دەهێنا کە نابێت لەم ڕێگایەی
گرتوویەتییە بەر لابدات و پۆشمان ببێتەوە! مەگەر
بە دەگمەن – لە هەندێ حاڵەتی فیگاری و بێزاریدا

نەبێ – ئەگینا زۆربەی کات، لە کانگای خۆیەوە هەستی دەکرد کارەکەی ئەو تەنیا کارێکی حزبی یان سیاسی و نیشتیمانی نیە، بەڵکو کارێکی مرۆڤایەتییانەشە!

ئەختەر ئەو شەوە وەک دەیان شەوی دیکە، دەبووایە دانیشێت ڕاپۆرتی تایبەتی خۆی بنووسێت: بۆئەوەی سبەی شەو، یان دوو سبەی شەو، کاتێ جوامێر دێتە لای، ڕاپۆرتەکە بە جوامێردا بگەیەنێتە دەزگای کاروباری نهێنییە عەسکەری و سیاسییەکانی حزب لە شاخ.



## ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر (٤)

ئەختەر، زۆربەی دەمەوعەسران، دووای ئەوەی ئاوێنەکەی بەجێدەهێشت، بە کراسێکی گوڵگوڵیی عەرد نارنجییەوە، کورسییەکی ڕادەکێشایە ناو چیمەنەکە؛ چیمەنەکەی پڕ دەکرد لە بۆنی سمڵ و مێخەک.

پێش ئەوەی «پوورە ڕەعنای ژنی سەلیم سەرپانی نەوتفرۆش» یان «باجی بناری ژنی مامەندە مۆن» کە عادەتیان بوو هەندێ ئێواران سەری لێبدەن، لێی بێنە ژوورەوە؛ دەچووە چیمەنەکە، جگەرەیەکی لەنێوان هەر دوو پەنجەکانی ڕادەگرت و قاچەکانی

## ژیانی شەوانەی ئەختەر (٤)

ئەختەر، زۆربەی دەمەوعەسران، دووای ئەوەی ئاوێنەکەی بەجێدەهێشت، بە کراسێکی گوڵگوڵیی عەرد نارنجییەوە، کورسییەکی ڕادەکێشایە ناو چیمەنەکە؛ چیمەنەکەی پڕ دەکرد لە بۆنی سمڵ و مێخەک.

پێش ئەوەی «پوورە ڕەعنای ژنی سەلیم سەرپانی نەوتفرۆش» یان «باجی بناری ژنی مامەندە مۆن»کە عادەتیان بوو هەندێ ئێواران سەری لێبدەن، لێی بێنە ژوورەوە؛ دەچووە چیمەنەکە، جگەرەیەکی لەنێوان هەر دوو پەنجەکانی ڕادەگرت و قاچەکانی بەسەر مێزە بچکۆڵەکەی بەردەمییەوە ڕادەکێشا و لە

بەسەر مێزە بچکۆڵەکەی بەردەمییەوە ڕادەکێشا و لە
تویی چڵ و گەڵا و لقی دارهەرمێکانەوە تەماشای
ئاسمانی دەکرد:
– باشە، من چی بکەم؟
– جوامێر ناتخوازێت!
– جوامێر ئەگەرچی ڕۆشنبیرە، ئەگەرچی زۆریشی
خۆش دەوێیت؛ بەڵام جەسارەتی ئەوە ناکات تۆی
«سۆزانی» و «ڕیسوا» بخوازێت!
– جوامێر لەوە دەترسێ، ئەگەر تۆی خواست،
خەڵک پەنجەی بۆ درێژ بکەن و بڵێن: ئەوەتا،
هەموو کوڕی سلێمانی خۆی بە «ئەختەری قادر
قوتوو» کردۆتە پیاو؛ کەچی ئێستا ژنی ئەو
پاڵەوانەیە کە هەموو سلێمانی شانازیی پێوە دەکا.

تویی چڵ ر گەڵا و لقی دارهەرمێکانەوە تەماشای
ئاسمانی دەکرد:
– باشە ئەگەر جوامێر منی بەڕاستی خۆش بوێت؛
بۆچی نامخوازێت؟!
– پوورە ڕەعنای ژنی سەلیم سەرپان بە ئەختەری
دەگوت:
– بەخوا کچم، ئەو جوامێرەی تۆ باسی دەکەی،
دەستی دەستێت پێدەکات.
– تۆ بڵێی؟
– باشە، ئاخر تۆش.. چ ژنێک دەتوانێ وەک تۆ
هێندە ساڵە چاوەڕێی پیاوێک بکات: دڵنیاش
نەبێت لەوەی ئایا دەیخوازێت یان نا؟!
باجی بناری مامەندە مۆنیش بە پوورە ڕەعنای



– کەس باسی ئەوە ناکا کە هەر ئەو پاڵەوانە
خۆیشی کاتی خۆی ئەختەری کردۆتە «سۆزانی».
– هەر چۆنێک بێ، جوامێر ترسنۆک و درۆزنە.
– باشە، ئێستا؛ من چی بکەم؟
لە کۆتاییدا، ئەختەر ، هەموو دەمەوعەسرانێک،
سەرلەنوێ، ئەم پرسیارەی لە خۆی دەکردەوە:
– باشە، بەڕاستی، سەرەڕای هەموو شتێک، من
بۆچی شوو بە مولازم تەحسین نەکەم؟! بۆ نا؟
– ئێستا دەڵێن: «ئەه !»، «تەیری پووت عاشق
بە داری زەقنەپووت».
– هەندێکی دیکەش دەڵێن: «ئەوەتا، قەزان
قەپاغەکەی خۆی دۆزییەوە».
– پێشمەرگە و جەماعەتی شاخیش بە جنێو

دەگوت:
– پوورە ڕەعنا، ئاخر جوامێر ئەگەر بیشیخوازێت،
ئەختەر دەبێ لەگەڵی بڕواتە شاخ، ببێتە پێشمەرگە!
پوورە ڕەعنا دەیگوت:
– جا قەیدی چیە؟ ناچێ؟ ئەرێ ئەختەر، ئەگەر
جوامێر بێتە خوازبینیت، بەگەڵی ناکەویت بۆ شاخ؟
ناچی؟
ئەختەر فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتی خۆی
دەسڕییەوە، دەیگوت:
– بۆ ناچم؟
پوورە ڕەعنا دەیگوت:
– دەیان پێشمەرگە هەن ژنەکانی خۆیان لەگەڵ
خۆیان بردۆتە ئەو شاخە و هەردووکیان پێشمەرگەن.

دەمشۆنەوە و دەڵێن: «ئەوەتا دەرکەوت: «ئەختەرە قەحپەی قادر قوتوو جاسووس بوو! چۆن دەنگوباس و نهێنییەکانی حکوومەتی لە مولازم تەحسین وەردەگرت و بۆ ئێمەی دەنارد، هەبێ و نەبێ بە هەمان شێوە، هی ئێمەشی گەیاندۆتە مولازم تەحسین. جاسووسی خەت مایلی هەر دوو لا بووە لە هەمان کاتدا؛ بەڵام لە کۆتاییدا دەرکەوت کە جاسووسی ڕاستەقینە و بەکرێگیراوی بەعس بووە».
دڵنیام ئاوهام پێ دەڵێن!
ئەختەر هەموو جار بە باجی بناری ژنی مامەندە مۆنی دەگوت:
– بەخوا هەر دەشمکوژن.
باجی بناری ژنی مامەندە مۆن تاقە کەسێک بوو کە ئەختەر نهێنییەکانی خۆی لەلا دەدرکاند. باجی بنار دەیگوت:
– ئەدی باشە مولازم تەحسین پێت ناڵێ: «ئەگەر شووم پێ بکەی، دەتخوازم و دەتبەمە بەغدا؟».
– با! دەڵێ «بەیەکجاری سلێمانی بەجێ دێڵین و دەچین لە بەغدا دەژین».
– ئەدی چی؟!
– هەر دەمکوژن!
– کێ دەتکوژێ؟
– پێشمەرگە.
– پێشمەرگە بۆ دەتکوژن، کچم؟ ژنێکی لێقەوماوی بێکەس، لە سای ئەو لەتکە قوزەی خۆتەوە دەژیت. ئەدی چی بکەیت؟ چارەت چی بوو؟

ئەختەر هەموو مانگی جارێک، یان دوو هەفتە جارێک چاوەڕوانیی جوامێری دەکرد؛ نیوەشەوێکی درەنگ لە دەرگا بدات! ئەختەر بەخشپە، بەئەسپایی، دەچوو دەرگای لێدەکردەوە، هەر لەناو دەرگا، پڕ بە دڵ، جوامێری لە هەمبێز دەگرت.
جوامێر، تەتەری شاخ، هەمیشە، کە دەگەیشتە ماڵی ئەختەر، کۆمەڵێک نامەی پێ بوو (نامەی پێشمەرگە و بەرپرسەکان) دەیانیدایە ئەختەر بۆئەوەی هەر سبەینێ دابەشیان بکات و بیانگەیەنێتە شوێنی پێویست؛ هەروەها هەمیشە دەیان نامیلکە و سیپارە و بەیاننامە و بڵاوکراوەی نهێنی کە تازە لە چاپخانەکانی ناو پێشمەرگە دەرچووبوون و پێویست وابوو بەناو شاردا، بەناو ئەندامەکاندا، بەناو خەڵکدا بڵاوبکرێنەوە؛ ئەوانیشی دەسپاردنە دەست ئەختەر. لە دەمەوکازیوانیشدا، کاتێ دەگەڕایەوە شاخ، کۆمەڵێک نامە و دەنگوباس و ڕاپۆرتی – بە قەڵەمی ئەختەر – دەبردەوە: بۆ دەزگای ڕاگەیاندن و بەشی نهێنییەکانی شۆڕش.
ئەختەر جارێکیان پێی بە جەرگی خۆیەوە نا، گوتی:
– جوامێر، من پێموابێ تۆ منت تەنیا بۆ ئیشی حزبی دەوێت و بەس!
جوامێر گوتی:
– چۆن؟
– تۆ من بەکاردەهێنیت بۆ مەبەست و

کە کچ بووی جوامێر دەستی خۆی پێت گەرم کردەوە و ڕۆیشت. ئێستاش، کە ژنیت، ئەوەتا لە سای خواوە، بەختت هەستاوە. بۆ دەتکوژن؟! شووت بە ئەمنێک کرد و تەواو، بڕایەوە! خۆشی دەوێیت و مەجبوورت بووە. لەوە باشتر؟ کچم، پاشان هەزار شتی ئاوها ڕوویداوە! ئەدی پێرارەکە، گەورە کچەکەی «حاکم حەمەومین» مێردی بە عەرەبێکی میسری نەکرد و لەگەڵی نەچوو بۆ میسریش؟ ئەدی تۆ دەتەوێ هەتا مردنێ خەڵک هەر پەنجەت بۆ درێژ بکەن و تا هەتایە هەر «ئەختەری قادر قوتوو» بمێنیتەوە؟! هەتا هەتایە خەڵکی گەڕەک هەر مەزبەتەت لێ بکەن و ئەم گەڕەک و ئەو گەڕەک بکرێیت؟ ناوی خوای لێ بێنە و شووی پێ بکە!

ئامانجەکانی حزب؛ ئەگینا...

– ئەگینا چی؟

جوامێر تووڕە بوو:

– حزب تەنیا حزبی من نیە؛ حزبی خۆشتە. پاشان ئەو کارانەی دەیکەی، ئەرک و کاری حزبیی خۆتن! بۆچی مەسەلەی حزب بە مەسەلەی پەیوەندیی خۆمانەوە یان بە منەوە گرێ دەدەیتەوە؟ هەر کاتێکیش باوەڕت بەم خەباتە ژێرزەمینییە نەما، دەتوانی ئیستیقالە بدەیت و واز لە حزب بهێنیت، ئەختەر!

ئەختەر کە جوامێری بەقەد ڕۆحی خۆی خۆشدەویست، گوتی:

– جوامێر گیان، من حەزدەکەم ئەوەت پێ بڵێم کە



تەواو.

– ئەیەڕۆ، یەعنی، شوو بە ئەمنێک بکەم؛ باجی بنار؟

– ئەدی چ دەکەی؟ شوو بە کێ دەکەیت، ئەختەر؟! چاوەڕێی چیت؟

– ئەدی جوامێر؟

– کچی خۆم، ئەختەر! باوەڕم پێ بکە، خۆ من بە قەد ئەو دونیایە ئەو چاوە جوانانەی تۆم خۆش دەوێ...

– خۆ جوامێر بەمە بزانێ، شێت دەبێ..!

ئەختەر، چەندی دەیکرد و دەیکرد، نەیدەتوانی دەسبەرداری عەشقی جوامێر بێت. عەشقی جوامێر لەناو دڵیدا ببووە ڕازێک،تێکەڵی غەم و بیرەوەری

من ئەو جەربەزەییە ترسناکەی لە ژیانی خۆمدا دەیکەم، هەمووی لەپێناو ئەوەیە کە بە تۆ بگەم! پێموابێ لە هەموو سلێمانی، هیچ ژنێکی دیکە نیە ئامادە بێت ئەو جەربەزەییانە بکات کە من دەیکەم. من سەرجەم ژیانم بەخشییە تۆ و حزب؛ ئێستاش هەر لەپێناو تۆ و حزبدا دەژیم و هەم.

– ئاخر بزانە، هەر بۆیەش سەرکردایەتیی حزب ئەو تەقدیرە گەورەیە لە تۆ دەنێ! تەنانەت لە دووایین کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسیی حزبدا، چارەگە سەعاتێک، هەموو ئەندامان، باسی ئەو فیداکاری و لەخۆبوردوویی و ڕۆڵە گەورەیەی تۆیان کردووە کە لەناو شاردا سپاردراوەتە تۆ!

– بەڵام من تۆم بەلاوە گرنگترە. تۆ؛ تۆ خۆت

و خەونەکانی ئەم شارە ببوو. وازهێنان لە جوامێر، لای ئەختەر، وازهێنان بوو لە شارەکەی، لە کێشەیەک! هەر چۆنێک بێ، چارەسەری دیکەی نەبوو- هیچ نەبێ حاڵی حازر- هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو: یان جوامێر یان مولازم تەحسین.. لەم دووانە دەبێ یەکێکیان هەڵبژێرێت! جوامێری پێشمەرگەی «پاڵەوان» کە هەموو سلێمانی شانازیی پێوە دەکات؛ یان مولازم تەحسینێکی ئەمنی دوژمنی گەل کە چەندین ساڵە هەموو ئەم شارەی لە زەواق ناوە؟

– ئاخر، تۆ خۆشت دەزانی، ئەختەر؛ جوامێر.. تەواو، دەستی خۆی پێت گەرم کردەوە و تەواو؛ حەیا و نامووستی خستە کیسێکەوە و تەواو!

لەبارەی منەوە دەڵێی چی، جوامێر؟

– من بڵێم چی؟

– دووای ئەم هەموو ساڵانە کە پێکەوە ژیانمان بەسەربردووە؛ چارەنووسی «ژن و مێردایەتیی ئێمە» بە چی دەگات؟

– «ژن و مێردایەتیی ئێمە»ی چی؟ چما ئێمە ژن و مێردین، ئەختەر!

– ژن و مێرد نین، جوامێر؛ بەڵام ئێمە لە ژن و مێردێک زیاتر یەکترمان خۆش دەوێ؛ بەقەد ژن و مێردێک زیاتریش شتمان لەنێواندایە...

– تەواو، ئەمەیە مەسەلەکە! ئەختەر گیان، ئەوەی لەنێوان من و تۆدا هەبووە و هەیە، لە ژن و مێردایەتی زۆر پیرۆزتر و گەورەترە. ئەمەندە بەسە!



جوامێر ئەگەر تۆی بویستایە، دەمێک بوو لەگەڵ خۆیدا دەیبردیت بۆ شاخ.

– ئەدی مێرد بە عەرەبێکی بەعسی بکەم، باجی!؟ بە ئەمنێک؟

باجی بنار دەیگوت:

– خۆ عەرەبیش بەشەرن، کچم! بە خوا ئەو مولازم تەحسینە ئەگەر ئەوەندە شێت و شەیدات بێ کە باسی دەکەی؛ کاتێ شووت پێی کرد، ئەگەر پێت خۆش بێ و داوای لێ بکەی، واز لە ئەمنایەتییەکەیشی دەهێنێ و بۆ خۆی دەچێ کاسبییەکی دیکە دەدۆزێتەوە. ئەوەیە ئیتر: هەر کەسە و عەیبێکی خۆی هەر هەیە.

– بڵێم چی!

– تۆ هیچ ڕەچاوی ئەوە ناکەیت کە ئێمە لە شارێکی دوواکەوتوودا دەژین؛ خەڵک قسە دەکا...

– ئەگەر بە گوێی خەڵک بکەین، دەبێ دەست بە چاوی خۆمانەوە بگرین، دەبێ هیچ نەکەین!

– ئاخر منیش وا ئاسوودە دەبم کە بە خەڵک بڵێم: ژنی جوامێرم.

– تۆ ترسنۆکیت ئەختەر؛ تۆ ناتوانی ڕووبەڕووی خەڵک بوەستیتەوە! ئەمە ترسنۆکییە.

– ئەدی ئەمەی تۆ، ترسنۆکی نیە؟

– کامە؟

– کە تۆ خۆشت دەوێم و لەگەڵم دەخەویت و دەشتەوێ بمخوازیت؛ بەڵام ناوێریت بمخوازیت.

– من جارێ ناتخوازم.

– ئێـمـە هەمـیـشـە ئاوها دوودڵین لە کـاتی شووکردندا. ئەمیان قۆزە، بەڵام موڵک و سامانی نیە. ئەویان کوڕە عائیلە و دەوڵەمەندە، بەڵام پوورێکی هەیە بێ ئەخلاقە. ئەوەی تریان شەیدات بووە، بەڵام تەمەنی بۆ تۆ موناسیب نیە. یەکێکی دیکە قۆزە و دەوڵەمەندە و هەموو شتێکە، بەڵام نازانم چی و چیەتی؟! وەڵڵا کە من شووم بە مامەند کرد، هیچ لەوەم نەپێچایەوە مامەند کوڕی کێیە و کاری چیە و چ دەکا و چۆن دەبێ! پیاو ئیتر بۆ خۆی دەزانی چ دەکا و چ ناکا. بەڵام ئەختەر، من پێم وابێ تۆ لەبەر شتێکی دیکەتە کە ناتەوێ شوو بە مولازم تەحسین بکەی؟

– لەبەر چیمە؟

– بۆچی؟

– جارێ ناتوانم بتخوازم.

– بۆچی جوامێر؛ بۆچی جارێ ناتوانیت بمخوازیت؟! چونکە من ئێستا، بە چاوی تۆ و بە چاوی خەڵک «ژنێکی سووکم» وا نیە؟ «ژنێکی قەحپەم» وا نیە؟ ئەمەیە هۆی ئەوەی کە ناتوانیت بمخوازیت.

جوامێر، کە پێشخواردنەوەکەی ئەختەر دڵی داخورپاند؛ خەریک بوو ئەویش بداتە پرمەی گریان؛ تەماشای فرمێسکەکانی ئەختەری دەکرد؛ بە ئەختەری نەگوت: «ڕاست دەکەی، هۆیەکەی ئەمەیە»، گوتی:

– نەخێر، ئەختەر، هۆیەکەی ئەمە نیە.



– لەبەرئەوەی مولازم تەحسین ژنی هەیە؟

– ژنەکەی لە بەغدایە.

– قەیدی چیە ژنی هەیە؟

– گیروگرفتەکە ئەمە نیە.

– قابلیە بتباتە بەغدا و لەوێ بەرەڵات بکا؟ قابیلە بۆ چەند مانگێک بتکاتە ژنی خۆی و پاشان لەو بەغدایە بەتاقی تەنیا بەرەڵات بکات؟ ئەدی تۆ نابیتە خێزان و شەرەف و نامووسی ئەو؟! ژنی هەیە، قەیدی چیە؟

– گیروگرفتەکە ئەمە نیە.

– ئەدی چیە؟

ئەختەر قەیرێک بیری کردەوە:

– نازانم.

دەشگەڕا بۆئەوەی پاساوی دیکە بدۆزێتەوە:

– بەڵگەشم بۆ سەلماندنی قسەکەم ئەوەیە (تۆ خۆشت باش دەزانیت): من مارکسیم و باوەڕم بە پرەنسیپەکانی مارکسیزم هەیە لەم بارەیەوە. ئەمەی تۆ باسی دەکەی: «سووکی» و «قەحپەیی» و عیلاقاتت لەگەڵ پیاو و ئەم شتە قۆڕانە... هەرگیز نابنە ڕێگر لەبەردەم بڕیاری مندا. من هەزار جار پێم گوتووی: ئەخلاق تەنیا ناوگەڵ نیە! ئەخلاق هوشیاریی شۆڕشگێڕانەیە.

جوامێر، کە بەڕاستی ئەختەری زۆر خۆش دەویست؛ دڵی نەدەهات بە ئەختەر بڵێ: «من ئەگەر تۆ بخوازم، خەڵک پەنجەم بۆ درێژ دەکەن و دەڵێن: ئەوەتا، جوامێر، لە کۆتاییدا هەر ئەختەری قادر

هەمــوو ئێــوارەیەک، کــاتێ باجی بناری مـامــەندە
مۆن لەگەڵ ئەختەر یەکانگیری یەکتر دەبوونەوە، ئەم
دیمەن و گفتوگۆ بنبەستە، هەمیشە دووبارە دەبۆوە؛
نەدەگەیشتنە هیچ ئەنجامێک. لە کۆتاییدا، ناچار،
باجی بنار دەستی دەدایە عەباکەی خۆی و دەیگوت:
– دەی، کچم؛ من هەڵدەستم دەڕۆم. خوا چۆنی
چاکە، ئاوهات بە نسیب بکا، یارەببی!

قوتووی خواست». بە ئەختەری دەگوت:
– خۆشم دەوێی، زۆرم خۆش دەوێی؛ بەڵام ئێستا
ناتوانم بتخوازم. تەواو.
ئەختەریش دەیگوت:
– تۆ دوودڵێت، جوامێر.
– چۆن؟
ئەختەر دەیگوت:
– من دەزانم: تۆ زۆر منت خـۆش دەوێ؛ زۆریش
بـاوەڕت بەو کــتــێب و تیــۆرانەوە هەیە کــە لە
مـارکسیـەتدا بەرگری لە ماف و ئازارەکـانی ژنێکی
وەک مـن دەکـــەن، بـەڵام کـــاتێ دەتـەوێ ئـەم
خۆشەویستی و تیـۆر و باوەڕانە بکەیتە واقیع و لە
ژیانی خــۆتدا لەگــەڵ من (لەبارەی پەیوەندییە

خـۆمـانەوە) جـێـبـەجـێـیـان بکەیت؛ نـاتوانیت؛
دەترسیت. تۆ دەترسیت، جوامێر.
– لە چی دەترسم؟
– لە واقیعەکە دەترسیت.
جوامێر، لەبەر خۆیەوە، بە تانە و پێکەنینەوە، بە
زمانی ئەختەر بە خۆی گوت:
– کەواتە، «من ڕووناکبیرێکی ترسنۆکم»!
– چونکە تۆ جەسارەت ناکەی بمخوازیت.
– ئەمە ترس نیە.
– با، ئەمە ترسە. تۆ ناوێریت بمخوازیت.
– نەخێر، ئەمە یاخیبوون و ڕووبەڕووبوونەوەیە؛
تێکشکاندنی نەریتە کۆن و سەپاوەکانی ئەم کۆمەڵە
دوواکـەوتووەیە کـە واتێـدەگـەن ژن و پیـاو تەنیـا

لەرێگەی عەقدی زەواجەوە دەتوانن یەکتریان خۆش بوێت و کار لەپێناو گۆڕانی کۆمەڵدا بکەن!
– ئێمە ئەگەر ببینە ژن و مێرد، لە ئێستا باشتر دەتوانین لەپێناو گۆڕانی کۆمەڵ کار بکەین!
– مانگی ڕابردوو، کتێبەکانی ڕۆزا ئەهرەنبۆرگ و سیمۆن دی بوڤوار و ئەنجێلا دیڤزم بۆ هێنابووی؛ بچۆ بیانخوێنەوە؛ دڵنیام دووای خوێندنەوەی ئەزموونی ئەو ئافرەتە شۆڕشگێڕانە، بڕیار و بۆچوونەکانت لەبارەی ئەم مەسەلانەوە دەگۆڕێن! ئەم ئافرەتانە هەتا مردن هەر بەبێ عەقدی زەواج لەگەڵ خۆشەویستە هاوڕێ و هاوخەباتەکانی خۆیاندا ژیان..
– جوامێر، گوێ بگرە! تاقە عەیبێکی



شەخسیەتی تۆ ئەوەیە کە لەناو کتێبدا و بەپێی کتێب دەژیت لەگەڵ مندا؛ هەر کە لە کتێبیش دێیتە دەرەوە جەسارەت ناکەی. تۆ، لەجیاتی ئەوەی کتێب ژیانت فێر بکات و ئازات بکات؛ دوودڵ و ڕاڕا و ترسنۆکی کردوویت.
جوامێر، لەبەرخۆیەوە، وەک لە شتێک پۆشمان بووبێتەوە، غەمگینانە گوتی:
– کتێب لە سەرەتادا هەموومان فێر دەکات؛ لە ئەنجامیشدا هەموومان ترسنۆک.
جوامێر کاژەڵاکی خۆی لەناو هەر دوو دەستی خۆیدا ڕاگرتبوو، هەناسەیەکی خەفەتی هەڵکێشا، ڕووی کردەوە ئەختەر:
– ئەختەر گیان، باوەڕم پێ بکە: مەسەلە ئەوە

نیه كه تۆ وای تێدەگەی!
ئەختەر دەگریا:
- شاڵڵا لە یەكەم ڕۆژەوە نەمناسیتایە! كە
ناسیمت و كردمت بە ژن، یەكسەر بتكوشتمایە!
- ئەختەر، گوێ بگرە! ناچارم نهێنییەكی حیزبت
پێ بڵێم لەم بارەیەوە.
ئەختەر بە ساردی و هیلاكییەوە:
- چیە؟
جوامێر خۆی كۆكردەوە قسە بكات:
- مەسەلەكە پەیوەندیی بە مەكتەبی سیاسی و
سەركردایەتیی حزبەوە هەیە. تێگەیشتی!
- چی؟!
جوامێر گوتی:



- ئەوان؛ ئەوان ڕێگە نادەن جارێ بتخوازم.

دركاندنی ئەم نهێنییە، لەو كاتەدا، بۆ ئەختەر
شتێكی زۆر تازە بوو. ئەختەری داچڵەكاند؛ كەوتە
بیركردنەوەیەكی قووڵەوە:
- ئەوان ڕێگە نادەن جارێ بمخوازیت؟!

## ژیانی ڕۆژانەی ئەختەر (5)

ئەختەر ئەو نیوەڕۆیە، وەک دەیان نیوەڕۆی دیکە، دەعوەتی مولازم تەحسینی کردبوو: دیسان کفتەی سابوونکەرانیی بۆ لێنابوو.

ئەختەر، لەسەر نانخواردن، گوتی:

– تەحسین پرسیارێکت لێدەکەم!

– چیە؟

– تۆ لەناوبردنی پێشمەرگە و پیشەکەی خۆتت پەلاوە گرنگترە یان ژیان لەگەڵ مندا؟

مولازم تەحسین دەستی لە خواردنەکە سارد بۆوە:

– ئەم پرسیارە عەنتیکەیە چیە ئەمڕۆ لێم دەکەی،

## ژیانی شەوانەی ئەختەر (5)

ئەختەر ڕووی لە جوامێر کرد:

– مەسەلەی خوازبینیی من چ پەیوەندییەکی بە مەکتەبی سیاسیی حزبەوە هەیە، جوامێر؟

جوامێر، شڵەژاو، وەک پۆشمان بووبێتەوە لە درکاندنی ئەم نهێنییە و بەڵام ناچاریش بێت ڕوونی بکاتەوە، ڕوونی کردەوە:

– پێیان وایە ئەگەر تۆ لەگەڵ من بێیتە شاخ، کەناڵێکی گرنگی پەیوەندیان لەگەڵ ناوشار لەقیس دەچێ!

ئەختەر کە ئەمەی بیست، زیاتر شڵەژا، دووای قەیرێک بیرکردنەوە، گوتی:



ئەختەر؟

ئەختەر بۆ خۆیشی پێکەنینی هات:

– نا. مەبەستم: ئەگەر شووت پێ بکەم واز لەم پیشەیەت دەهێنی؟

– دڵنیابە، ئەختەر؛ بەڵام هەر دەبێ بڕۆین بۆ بەغدا و لەوێ بژین!

ئەختەر، لە دڵی خۆیدا بەراوردی هەڵوێستی مولازم تەحسینی لەگەڵ هەڵوێستی جوامێر دەکرد.

– سەیرە! ؟

– پێیان وایە هیچ ئافرەتێکی دیکەی وەکو تۆ بۆ ناو شار نادۆزنەوە!

– یەعنی ئێمە ناتوانین پێکەوە لە شاخ ژن و مێرد بین و بە پێشمەرگایەتی بژین؟!

– جارێ قبووڵ ناکەن لەگەڵ خۆمت ببەم.

ئەختەر دووای قەیرێک بیرکردنەوە، گوتی:

– کەواتە، جوامێر؛ یەک پرسیارت لێدەکەم!

– چیە؟

– تۆ، مانەوەت لەناو حزبدا لەلا گرنگترە یان گەڕاندنەوەی شەرەفی ژنێکی کورد، کە منم؛ خۆشم دەوێیت و هەموو ژیانم لەپێناوتدا بەخت کردووە؟

جـوامـێـر بەم پرسـیـارە کـەوتە تالووکـەوە، بە ئەختەری گوت:

– ئەختـەر، بەڵـێنت دەدەمێ؛ سەرلەنوێ قسـەیان لەگـەڵ دەکـەمـەوە، داوایان لێـدەکـەمـەوە. تەنانەت ئامـاژە بەوەش دەدەم کـە تۆ لەناو شـاردا تا ڕادەیەک کـەشف بوویتـە و مـەترسـیت لەسـەرە. ئەگـەر هەر قبووڵـیشـیان نەکرد بتـخوازم و بتبەم، دڵنیـابە: هەر دەتخوازم...

– ئەدی ئەگـەر چووینە شـاخ و پەسـەندیان نەکرد؛ وەک ژن و مێردێک وەریان نەگرتین؟!

– بەڵێنت دەدەمێ: تەسلیـمی حکوومـەت دەبمەوە و لێرە دەتخوازم.. پێکەوە دەژین.

– بەڵێن؟!



– بەڵێن!

جـوامـێـر کـاتێ بەڵـێنی خـۆی بە ئەخـتـەر دا، پەنجەکانی دەستی چەپی، تا قەراغ هەناوی ئەختەر ڕۆشتبوون.

باجی بناری ژنی مامەندە مۆن، لە حەوشەکەی
ماڵی خۆیان، لەژێر دارمێوە پڕ لە جریوە جریوەکاندا،
قاچی ڕاستی بەدیار سەماوەرەوە ڕاکێشابوو؛ قسەی
بۆ پوورە ڕەعنای ژنی سەلیم سەرپان دەکرد:
– پوورە ڕەعنا، بە قەبری کوڕە جوانەمەرگەکەم..
هانێ، دەی، ئەوەندە گوڵەبەڕۆژەیەم لەگەڵ بقرتێنە..
ئەوە من مردوو و ئەتۆ زیندوو.. ئەگەر جوامێر ئەو
ئەختەر بەدبەختەی خواست، وەرە تۆ ئەم قۆڵەی من
ببڕە!
– ئەوە تۆ بەڕاستتە...؟
– کچێ، خۆشیی چی دەوێ؟ خۆشویستنی چی و
حاڵی چی؟ خۆشویستن ئاوها دەبێ؟ چی؟ چی،
چی؟! بۆ پێی ناکرێ؟ بۆ نابێ؟ سەدان پێشمەرگە
بەم شاخەوەن و ژنەکانی خۆیان لە باخەڵی خۆیان
هەڵگرتووە و وەک نووری چاوی خۆیان دەیپارێزن!
ئەم درۆ دەکا.
– دەبێ پیاوێکی درۆزن و غایەن بێت و بیەوێ
دەستی دەستیی پێ بکا!
– دە تۆ وازیان لێ بێنە، بۆ خۆیان با یاری بکەن!
لێیان گەڕێ! دە لێیان گەڕێ، توخوا، منداڵن! ئێ
قەیدی چیە؟ ئەدی خۆیان بە چیەوە مەژغوول بکەن؟
بە قسەی ئەختەر، سێ ساڵ زیاترە یەکتر دەناسن.
ئەدی! بەڵێ. سێ ساڵ زیاترە یەکتر دەناسن.
ئەیەرۆ؟! بەڕاستتە؟! ئەمەی بە تۆش گوتووە؟! ئەوە
بزانە، ڕەعنا؛ من پێشم گوت: ئەوەندە دەمشڕ مەبە!
هەرچەند خۆ تۆش، وەک من بۆ ئەو، بێگانە نیت.
بە خوا، بە گۆڕی کوڕە جوانەمەرگەکەم،
بەقەد کیژە گەورەکەی خۆمم خۆشدەوێ. دەزانم، بە
خوا دەزانم. ئنجا ڕاست دەکەی. گوناحە. ئەرێ بە



خوا گوناحە. ئەرێ بە خوا بێکەس و هەژارە. چ
بکەین! خوا ڕەحمی پێ بکا. چ بکا! دە وازی لێ
بێنە، توخوا، ئاخر منداڵە.. ئەدی خۆی بە چیەوە
مەژغوول بکا؟ ها؟ نا، نا. هەر ئەوەندەی بە من
وتووە. نازانم، نەوەڵڵا. من لێم نەپێچایەوە چۆن
بوو. ئیتر ژن هەر ژنە، بە خوا، دایکم. نە وەڵڵا.
جوامێر لە دایەرەی زراعە، مودیری بووە و حەزی
لێکردووە. نا، نا، جوامێر حەزی لە ئەختەر کردووە.
حەزی لێکردووە و لە کۆتاییدا ڕۆژێک بردوویەتیە
ماڵەوە و هەر لەوێ لە ماڵی خۆی ئیشی خۆی لەگەڵ
کردووە.
– کچێ، ئەو ژنە سەرشینە، زۆر سادەدڵ و
خۆشباوەڕیش دیارە. خۆ هیچیشی لە دەم
ڕاناوەستێ. بەخوا ئەمشەو ترێک بکا، سبەینێ بۆ
خەڵکی دەگێڕێتەوە.
– ژنی ئەوەندە سادەدڵم قەت لە دنیا نەدیوە! نە!
چی؟ نازانم. باسی شتی وای بۆ من نەکردووە. دە،
وا بلێ! کەواتە، باوەڕ مەکە؛ نەء. ئەمە ڕاست نیە.
کێ؟ دەک لەشی داڕزێ و خوا بۆ لای خۆی
بیباتەوە. «ئامەی عەزە قۆڵبڕ» لە خۆیەوە ئەم
قسانەی هەڵبەستووە. هەزار جارانیش لای من
گوتوویەتی:
– من حەسسوودی بە ئەختەری قادر قوتوو دەبەم،
بۆ خۆی لێی داوە: دوو مێردی جوان و جاحێل و
ڕێک و پێکی هەیە. دەیانی دیکەش بە دەور و
خوولیدا دەسووڕێنەوە و خزمەتی دەکەن! وەڵڵا ژن
هەر ئاوها بووایە خۆش بوو، وەک ئەختەری قادر
قوتوو. ئێوەش، گێل گێل، دەڵێن: بەزەییمان پێیدا
دێتەوە. توخوا، ژن هەیە لە دنیا لەم قەحپەیە

بەختەوەرتر بێ!

ئامەی عەزە قۆڵبڕ، لەگەڵ «بەدیعە بنێشت» ئەمە حاڵیانە: لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە بەردەرگای حەوشە دادەنیشن و باسی ئەختەری بەستەزمان دەکەن! پێی گوتووە «دەتخوازم». ئەویش ئیتر ژنە، باوەڕی پێکردووە و هەڵخەڵەتاوە. گوناحی چیە؟ ئەرێ چایەکە گەرم نەکەمەوە، ڕەعنا؟ نا، نا، قابیلە چیە؟ هەر ئاگرێک لە سەماوەرەکە دەدەم و تەواو. چی؟! مەمەند؟ نەء، جارێ. ئەم خەتەت دیوە؟ خەتی شینی سەر دیوارەکە! هەر کە سێبەر دەگاتە ئەم خەتە شینە، یەڵڵا سەری مامەند بەدیاردەکەوێ. ڕاست دەکەی، «دادە شەفیقەی کڕنوو» قسەی خۆشە. بە خوا منیش سێ چوار ڕۆژێکە نەمبینیوە. خۆ لەوانەیە ئەمڕۆ دەرکەوێ. هاکا وەدیارکەوت، بەخۆی و پلێپلە و سەروسەکوتی زەنگیاناوییەوە. دەڵێی ژنە لادێییەکانی هەمەوەندە.

– کچێ ئەویش ئیتر گیری خواردووە بەدەست ئەو مێردە عارەقخۆرە قوماربازەیەوە. وەڵڵا، دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە نوێژی نیوەڕۆ هەتیو و مەتیوم لێ دێنێتە ژوورەوە و بەبەر چاوی خۆمەوە سواریان دەبێ!

ئەستەغفیرڕوڵڵا خوایە! ئەدی، خوشکم! ئێمە پیاوی خراپمان نەدیوە! دێ. دێ. هەر بزانە وەدیار کەوت. ئاخر بۆیە گوتم: سەماوەرەکەش ئاگربدەمەوە. بەس، توو قورئان، هیچی ئەختەر لای ئەو باس مەکە! ئەختەر سوێندی داوم. چی بکەین! پیاو هەموویان ئاوهان ئیتر. نا؟ ئەمەی بۆ باس نەکردووی؟ چۆن؟ لەناکاو بووە، لەناکاو. هەموو شتێک لەناکاو بووە. ئەمن و قووات خاصە، ئێوارەیەک، لەناکاو، ماڵەکەی جوامێر تۆق دەکەن و



دەیانەوێ بیگرن. ئیتر ئەویش، باش دەبێ لەو دەمەدا لە ماڵ نابێ. کاتێ خەبەری پێدەگا، ئیتر ناگەڕێتەوە ماڵ و بەیەکجاری ڕوودەکاتە شاخ. جوامێر حزبی بووە، هەر لەوساوە لە حزب گەورەش بووە.

– بەختی ئەختەری کەساس! بەڵام بەخوا، باجی بنار؛ جوامێر ئەگەر نەشبووایەتە پێشمەرگە و نەشچووایەتە شاخ، من واتێدەگەم هەر نەیدەخواست! تۆ واتێناگەی هەر بەئانقەستیش چووبێتە شاخ؟ پێشمەرگایەتیی کردبێتە هەنجەتێک بۆئەوەی نەیخوازێ؟! کێ؟ بەدیعەی بنێشت وای دەگوت؟ دە بەخوا ڕاست دەکا. من جارێک دیومە. پیاوێکی چاوحیز دیار بوو. دە بەخوا بەدیعەی بنێشت ڕاست دەکا. ئەو زۆر باش پیاوان دەناسێتەوە. توخوا، حەیف! ئەختەرێکی وها جوان، وها ژیکەڵە و خاتوون، دڵت نایە تەماشای بکەی، دەڵێی کچی کافرۆشە: بەم دەردەوە بچێ! بە قورئان شتێکت بۆ بگێڕمەوە، پێم باوەڕ ناکەی! زەڕەنگەرێکی ڕەفیقی سەلیم هەیە، ڕەفیقی ناوبازاڕیەتی، ئێوارەیەک گوایە – لەناو بازاڕ– چاوی بەم ئەختەرەی قادر قوتوو دەکەوێ؛ یەکسەر شەیدای دەبێت و دووای دەکەوێ.. تا ئەختەر دەگاتە ماڵ و ئیتر ماڵەکەی ئەختەر نیشان دەکا. پاشان کە سۆراغ دەکات و لێدەکۆڵێتەوە، دەبینێ «ئەختەر» لە گەڕەکەکەی ئێمەیە و دراوسێی ئێمەیە. یەکسەر دەچێتە لای سەلیم، دەڵێ: «سەلیم!»

سەلیم دەڵێ: ها؟

کابرای زەڕەنگەر دەڵێ:

– عاشقی خزمێکی ئێوە بوومە و دەمەوێ ژن

بێنم.
سەلیم دەڵێ: «کێیە؟»
کابرای زەڕەنگەر دەڵێ:
– دراوسێی ئێوەیە.
سەلیم دەڵێ:
– پیرۆزە! کچی کێیە؟
کابرای زەڕەنگەر دەڵێ:
– ناوی ئەختەرە.
سەلیم دەڵێ:
– ئەختەری قادر قوتوو نەڵێیی؟
کابرا دەڵێ:
– با! خۆیەتی.

بە گیانی تۆ، چۆنت بۆ دەگێڕمەوە، وایە. بەس دەستەودامێنتم، بۆ ئەختەری نەگێڕیتەوە! سەلیم بۆی باس کردم. کابرای زەڕەنگەر کە ئەختەری دیوە، یەکسەڵەف شەیدای بووە و بڕیاری داوە بچێتە داخوازیی ئەختەر. داوای لە سەلیم کردبوو کە ئیشەکەی بۆ پێک بهێنێت و پاشان ئیتر ژنان بنێرێتە داخوازیی. سەلیمی ملشکاو؛ تۆ بچی بە کابرای زەڕەنگەر بڵێیی: «قوربان، ئەو ئەختەرەی تۆ ڕۆن سەرف دەکا»! چۆن نازانی؟ ئەمە قسەی پیاوانە. یەعنی هینە... بە چی پێدەکەنی؟ ئای، ڕەزات خواتەوە، سەلیم! ئێ گوتم: «سەلیم، ملت شکێ! تۆ بۆچی بوویتە باعیسی ئەم کارە». ئنجا تۆ تەماشاکە، بەختی ئەختەری داماو! بەخوا ئاوها، پیاو هەر لە یەکەم بینینەوە شەیدای دەبن. سەلیم پێی گوتبوو:
– ئەگەر ئەوەندە شەیدای ئەختەریت، بچۆ ببە مشتەری!



کابرای زەڕەنگەر گوتبووی:
– حەیف!
– کێ ناڵێ پاشان چۆتە لای و ئێستا ئەویش مشتەریی نیە؟

کوڕم، دانیشە! دەک ... ئێ دە سکتر بە! دانیشە! خۆ لێناگەڕێ دوو قسە لەگەڵ ئەو ژنە بکەم. باجی بناریش دەڵێ «لێی گەڕێ منداڵە». سەیر، سەیر! تۆ سەرنجت داوە، باجی بنار، ئێمە قەت دڵمان نایە ئاوها باسی یەکتر بکەین. حەیای ژنەی لای ئەو پیاوە برد! توخوا، پیاو چەند دڵڕەقن!

– چما ئەوەی کە خۆشی دەوێ، زۆر دڵنەرمە لەئاستیدا؛ تا ئەوانی دیکە دڵنەرم بن؟ ها؟ بەڵێ، بەڵێ. منیش هەر وای تێدەگەم. ڕاست دەکەی. بە مەرقەدی کاکەحەمەدی شێخ، بە گۆڕی کوڕە جوانەمەرگەکەم، من پێموایە تەنیا بۆ ئەوە بەکاری دەهێنی کە هەواڵ و دەنگوباسی ناو شاری پێ کۆبکاتەوە و وەرەقە و مەرەقانی پێ لەناو بازاڕان بڵاوبکاتەوە!
– دەزانێ ئەو جۆرە کارە حیزبی و میزبییانەی بە ژنان دەکرێ، بە پیاوان ناکرێ.
– هەر ڕۆژێکیشە، ئەم وەرەقە و مەرەقە و بەیان و مەیانانەی لەدەست دەگیرێت و سەریشی بە فەتارەت دەچێ لەسەر جوامێر! ئیدی، هەموو ژیانی، لەناو ئەمنە سوورەکە دەرزێتەوە.. تێر تێر... پاشان زیندەبەچاڵیشی دەکەن! با پشتی بە مولازم تەحسین قایم کا، قەیناکە! بەخوا، هەر بەئانقەستیش ئەم کارانەی پێ دەکات؛ بۆئەوەی سەری بە فەتارەت بدات و لە کۆڵ خۆی بکاتەوە! ئەدی خوشکم. من

دەزانم، تۆ ئاگات لە هیچ نیە. من دوور و نزیک ئاگام لێیانە: جوامێر هەموو مانگی جارێک لە شاخەوە دادەبەزێتە ناو شار، دەچێتە لای. دە، توخوا، وازیان لێ بێنە، مندالّن! با بۆ خۆیان لەگەڵ یەکتر بغافلّێن. ئەدی خۆیان بە چیەوە مەژغوول بکەن؟ بەخوا گوناحە. گوناحیان دەگاتێ کە هێندە ئەزیەتی ئەم بەستەزمانە دەدەن! جوامێرە فەندی، کۆنە مودیری دائیرەی زراعە. هەتا ئەو بەعسی بوو! چما هیچ بەعسییەکی وەکو ئەو پیس لە سلێمانی هەبوو؟ کاتێ ڕۆیشتیشە شاخ، بووە «جوامێر»! گوایە لەناو شار «خەت مایل» بووە! دەردی «ئاکۆی قومری» ئاوهاشیان بە ئەو نەدەگوت؟! حکوومەتێکی گەورە و گران، قابیلە کەروێشک بە عارەبانە دەگرێ؟ چۆن نەیدەزانی جوامێر لەگەڵ پێشمەرگانە یان نا؟

– ئەدی چۆن کردبوویانە مودیر؟

– وا نیە؟ ئەمڕۆ کێ دەکرێتە مودیر ئەگەر جێی متمانەیەکی زۆری حکوومەت نەبێ؟ خەڵکی کەریش شانازیی پێوە دەکەن: گوایە خەت مایل بووە و بۆ پێشمەرگە ئیشی کردووە.

– بەخوا هەر لەدەست ئەختەری بەستەزمان ڕایکرد؛ بۆئەوەی نەیخوازێت!

– ئەدی! وەکو کوڕەکەی مالّی «دکتۆر شەوکەتی عەمەلیات» سالّی پێرار، بەبیرت دێ: ئەویش کچەکەی «سەعەکەڕی حەمامچی»ی کردە ژن و پاشان، بۆئەوەی لەدەستی قوتار ببێت، لێیدا چوو بووە پێشمەرگە. ئەمڕۆ بووە بە عادەت: هەر کەسێک دزییەک بکا، حیزییەک بکا، کچێک هەڵبگرێ، پیاوێک بکوژێ، یان لە عەسکەری



فیرار بکا.. دەچێتە شاخ و دەبێتە پێشمەرگە! پێشمەرگایەتی بووە بە جێگەی دەیانی وەکو جوامێر و ئاسۆی دکتۆر شەوکەتی عەمەلیات. عەمریان نەمێنێ: کچان دەکەنە ژن و بەجێیان دێلّن، دەبنە پێشمەرگە.

– کچێ بنار، ئەختەر جوامێری زۆر خۆش دەوێ؛ ئێمە ئەم قسانە چیە دەیکەین؟!

– ئەمەش لە بەدبەختیی خۆیەتی کە هێندەی خۆش دەوێ. غێر، هەر لەسەرەتاوە، ئەم خۆشەویستییەی بوو کە مالّی کاول کرد.

– دەڵێ: تا هەتایە لەسەری دەوەستم.

– دەڵێ: ئەگەر خۆشی نەوێم، چۆن هەموو مانگی جارێک ئەو جەربەزەییە دەکات و بەناو ئەو شاخ و داخە ئەنگوستەچاوانەوە خۆی دەگەیەنێتە مالّەکەی من؟

– هەر ژن و مێردن؛ ژن و مێرد!

– دەبینی: دە تۆ بیری لێ بکەوە، ڕەعنا! پیاوێک ئەگەر هەست بکات کە دەبێتە مێردی ژنێک؛ چۆن بەوە ڕازی دەبێت ژنەکەی لەگەڵ پیاوێکی دیکەی غەیری خۆی بەزمی هەبێ؟!

– ئەیەڕۆ..!

– ئەمە ماقوولّە؟ بەڵێ؛ جوامێر باش دەزانێ ئەختەر بە چی دەژیت و چۆن دەژیت؛ تەنانەت بەم دووابیە، ئەختەر ئەوەشی پێ گوتووە کە مولازم تەحسین هاموشۆی دەکا.

– بە گۆڕی کاکەحمەدی شێخ، جوامێر دەزانێ.

– بەڵێ. ئەختەر خۆی پێی گوتووە.

– ئەمە تازەیە،

– بەڵێ. ئێستا وای لێ هاتووە: ئەمیان بە ڕۆژ،

ئەویان بە شەو.
– ئەیەڕۆ..!
– ئەیەڕۆی بۆ چییە؟ بەخوا. ئەمە چەند هەفتەیەکە، ئیشەکە گەیشتۆتە ئەو ئاستە و ئاوهای لێ هاتووە.
– ئێستا دەبێ هەموویان بەیەکتریان زانیبێ!
– بەڵێ. هەر ڕۆژێکە و ئیتر دەتەقێتەوە. ئەم ئیشە دەبێ بگاتە ئەنجامێک و کۆتاییەک. هانێ چاکەت بخۆرەوە، هەی هەشبەسەر!
– ئێستا پێم بڵێ، بنار، ئەختەر بڕیاری چیی داوە؟
– ئەختەر بڕیاری چی بدا؟ ئەو ژنە هێندە جوانە، برای خۆی عاشقی دەبێ؛ سەری لەم دوو پیاوەش شێواندووە.
– ئەیەڕۆ، ئەوە تۆ باتداوە سەر چی؟ تۆ قسەی زۆر عەنتیکە دەکەی!
– بۆ قسەی عەنتیکە دەکەم؟ بە قسەی خۆی: هەردووکیانی خۆش دەوێ؛ هەردووکیشیان شەیدای ئەو بوونە.
– ئەختەری قادر قوتوو!
– بەڵێ؛ ئەختەری قادر قوتوو.
– خۆزگەم بە ئەختەر!
– باش نیە ئەو سامانی جوانییەشی هەیە!؟
– ئەوەیە ئیتر؛ جوانییەکەی، سەری لە خۆیشی شێواندووە.
– تۆ دەزانی: جوانیش بەڵایە؟
– چۆن؟
– من دەڵێم: ئەگەر ئەختەر ئاوها جوان نەبووایە؛ ئەم سەریەشە و بەڵایەی تووش نەدەهات.



– ئێ هەڵبەتا! ڕاست دەکەی.
– جوانیی ئەو بۆتە هۆی نامۆبوونی خۆی و بەڵا بۆ خۆی.
– وای لێکردووە متمانە بە خۆی پەیدا بکات و ... هەموو شتێک بکات.
– هیچیشی، هیچ ئەنجامێکی نەبێت.
– ئەو جوانییەی ئەو سەری لە پیاوەکانیش شێواندووە.
– ئەرێ بەخوا.
– ئەوانیشی دوودڵ و ڕاڕا کردووە؟
– خۆی.. خۆی؛ مەرگەساتەکەی خۆی لە مەرگەساتی ئەوان بەسوێترە!
– نازانێ کامەیان هەڵبژێرێت!
– نەء؛ ئەو باش دەزانێ کامەیان هەڵبژێرێت.
– کامەیان؟
– ئەختەر دەیەوێ شوو بە جوامێر بکات.
– ئەدی بۆ نایکا؟
– دەڵێ: مولازم تەحسین خۆشتری دەوێم.
– ئەختەر درۆ دەکا.
– درۆی چی دەکا؟
– مولازم تەحسین خۆشی ناوێت، بڕوا ناکەم پێی گوتبێت «دەتخوازم».
– با.
– مولازم تەحسین ئەگەر چاوی لە ژنێکی ئەم سلێمانییە بێت؛ لێی دەپاڕێتەوە و پێی دەڵێ: «توخوا شووم پێ بکە»؟!
– ئەختەر بە جوانیی خۆی هەردووکیانی شەیدا کردووە؛ سەری لە هەردووکیان شێواندووە.
– ئاخری خێر بێ، یاخوا...

## ژیانی ڕۆژانەی موڵازم تەحسین (١)

ئەو نیوەڕۆیە، دەمەوکاتی نوێژی جومعە، نیو کیلۆ «تی ئێن تی» لەناو مەیدانی ماستەکەدا تەقیبۆوە. لایەکی پردەکەی (نزیک قاڵدرمەکانی) وێران کردبوو. نۆزدە کەس کوژرابوون، زیاتر لە سی و حەوت کەسیش بریندار بوون. تی ئێن تییەکە لەناو عارەبانەی شێلمفرۆشێک دانرابۆوە. لەدووای تەقینەوەکە، شێلمفرۆش و عارەبانەکەی هەلاهەلابوون.

موڵازم تەحسین، پشتەوە و پێشەوە و لاتەنیشتەکانی، وەک هەمیشە، یاوەرە چەکدارەکانی دەورەیان دابوو؛ لە شوێنی کارەساتەکە

## ژیانی شەوانەی جوامێر (١)

جوامێر، دووابەدووای تەقینەوەی نیو کیلۆ «تی ئێن تییەکە» لەناو مەیدانی ماستەکەدا؛ بۆ سبەینێ، لەگەڵ یەکەمین گەرد و گوڵی بەیانی، کاتژمێر چوار و نیو، بە خۆی و کۆمەڵێک بەیاننامەوە، گەیشتە قەراغ سلێمانی.

جوامێر، ئەم جارەیان کلاشنکۆف و چەکی قورسی پێ نەبوو، کورتەک و شەڵوارە مرادخانییەکەی جارانیشی لەبەر نەبوو: تەنیا یەک دەمانچەی چوارده خۆر بە لاکەلەکییەوە، لەژێر چاکەت. بەپێچەوانەی جارانیش نەیدەتوانی شەو لەلای ئەختەر بمێنێتەوە؛ ئەم جارەیان هاتبووە ناو شار



ڕاوەستابوو. خەڵک لە دەوریان کۆببوونەوە. میکرۆفۆنیان بۆ ڕاگرتبوو، بە دەنگی بەرز، بە زمانی عەرەبی، قسەی بۆ خەڵک دەکرد:

– ئەی جەماوەری بەشەرەفی خەڵکی سلێمانی!

بە ناوی حزبی سەروەرمانەوە، حزبی بەعسی ئیشتراکی، سەرەخۆشیتان لێدەکەم لەو پرسە ناگەهانەی کە ئەمڕۆ نیوەڕۆ، پێش چەند سەعاتێک، دەستەویەخەتان بۆتەوە. ئەو نۆزدە کەسەی لەم کارەساتەدا گیانیان لەدەستداوە بە شەهید حسێب دەکرێن و ئینشاڵڵا جێگەیان ناوەندی بەهەشتە. هاوبەشی غەمی کەسوکاریانین و خوا سەبووریبیان بداتەوە. ئەو هەموو خەڵکەی دیکەش کە بریندارن، ئێستا، دڵنیاتان دەکەینەوە کە

تەنیا بۆئەوەی پێنج سەد نوسخەیەک لەو بەیاننامەیە بڵاوبکاتەوە کە لەبارەی تەقینەوەی مەیدانی ماستەکە دەرچووبوو و یەکسەر بگەڕێتەوە!

کە گەیشتە ناو شار، هەستی بە برسێتییەکی زۆر دەکرد، لای بەردەرکی سەراوە وەرسووڕایەوە ئەو جادەیەی کە دەیبردەوە بەردەم سەرتاشخانەکەی (شەهید قادر کابان)؛ تەماشایەکی سینەماکەی کرد: کە جەوان بوو، چەنێک شەیدای ئەو سینەمایە بوو! جادە چۆڵ و سێبەر بوو: تەنیا چەند کرێکار و قوتابییەکی زانکۆ بەسەر ئەو جادەیەوە بوون. دڵی زۆر خۆش بوو کە ئەمڕۆ توانیویەتی، بەپێچەوانەی جارانەوە، سلێمانی بەڕووناکی ببینێ! جێگەی خۆیەتی، ئێستاش، بەپەلە بچێ، لە چایخانەی

لە نەخۆشخانەی کۆماری، لەژێر سەرپەرشتی و چاودێریدان و چارەسەر دەکرێن؛ ئینشالڵلا هەموویان چاک دەبنەوە.

جەماوەری خۆشەویستی سلێمانی!

ئەوەتا ئەمڕۆ بە چاوی خۆتانەوە دەبینن: ئەو تاقمە تێکدەر و بەکرێگیراوەی کە بەو شاخەوەن و ناویان لە خۆیان ناوە «پێشمەرگە» و «شۆڕشگێڕ» و «مارکسی - لینینی» و «نیشتیمانپەروەر».. سەرلەنوێ ئەو ڕاستییەیان بۆ گەل دووپات کردەوە کە چ ڕق و کینەیەکی ئەستووریان بەرامبەر بە ئێوە و ئەو خەڵکە بەستەزمانە هەیە کە لەناوچوون و بەشێکیشیان ئەوەتا وان لە گیانەڵانەدا! ئەوەیان سەلماندەوە کە چەنێک حەز بە ئاژاوە و ئەزیەتدانی

قەڵادزەییەکان نان و ماستێک و قاپێک هەنگوینە حەیاتەکە بخوا! ئەو ماست و هەنگوینە خۆشەی زیاتر لە سێ ساڵە لێی بێبەری بووە! بە بەردەم چێشتخانەکەی (عەلی سوور)دا تێپەڕی. ئەگەر نیوەڕۆ بووایە، دەچوو سەلامێکیشی لە عەلی سوور دەکرد و دیشلەمەیەکی خەستیشی لەلا دەخواردەوە! بەڵام نەخێر، چایخانەی قەڵادزەییەکان پڕە لە ئاشنا و هاوڕێکانی؛ هیچ نەبێ ئێستا (قالەشێت) دەیبینێت و لێی دەکاتە هەرا. با ئەم نان و هەنگوینەی لێ نەبێتە سندان و سەری بە فەتارەت نەچێ! هەر لە تەنیشت چێشتخانەکەی «عەلی سوور» لە یەکەمین چایخانەدا دانیشت.

پێنج سەد دانەی بەیاننامەکە، کە لەناو



خەڵکی سادەی بێگوناه دەکەن! ئایا تەقاندنەوەی نیو کیلۆ تی ئێن تی لەناو بازاڕێکی پڕ لە خەڵک، لەم شوێنەی ئێرەدا، چ زیانێک بە حزبی سەرەور و حکوومەتە خزمەتگوزارەکەمان دەگەیەنێ؟ ئەگەر ئەو تێکدەر و بەکرێگیراوانە مەبەستیان زیان گەیاندنە بە حکوومەت و حزبی سەروەر، بۆچی نایەن ڕووبەڕووی هێزەکانی حکوومەت و چەکدارە تێکۆشەرەکانمان ببنەوە؛ بۆچی دێن خەڵکی سادەی بێگوناهی سەر شەقام و ناوبازاڕ دەکەنە قوربانیی سەرلێشێواویی خۆیان؟ ئەگەر بیانویستایە خزمەتی گەل بکەن، دەهاتن چەند گوڵێکیان لەم شوێنەی ئێرەدا دەچاند، نەک تی ئێن تی!

تەقاندنەوەی نیو کیلۆ تی ئێن تی لەناو ئەم بازاڕە

بەستەیەکدا گرێی دابوون و خستبوونیە ناو لیڤیکسێکی گەورەی قوتابییانەوە، لەتەنیشت خۆی دانان؛ تا لە خواردنەکەش بۆوە، بەردەوام، دڵی لەسەر دەستی بوو!

بەیاننامەکە ئەوەی تێدا ڕوونکرابۆوە، کە مولازم تەحسین، دوێنێ، لە خیتابەکەی خۆیدا، تەقینەوەکەی ناو مەیدانی ماستەکەی داوەتە پاڵ هێزی پێشمەرگەی شۆڕشگێڕەوە؛ بەڵام پێویستە خەڵکی بەشەرەفی کوردستان بزانن کە هێزی پێشمەرگە لەو تاوانە خوێناوییە بێ ئاگا و بێبەرییە؛ بەڵکو حکوومەت خۆی ئەو نیو کیلۆ تی ئێن تییەی بۆ خەڵکی بەستەزمان داناوەتەوە بۆئەوەی سومعەی پێشمەرگە و شۆڕشی کورد لەلای

پڕ لە خەڵکەی ئێرەدا، لەلای ئەو بەکرێگیراوانەی ناویان لە خۆیان ناوە «پێشمەرگە» لەوانەیە تەنیا یەک پاساوی هەبێ، ئەویش ئەوەیە کە بانقێکی حکوومەت، لەنزیک شوێنی تەقینەوەکە هەیە. ئەم بانقەی کە دەیبینن! بێگومان لەوانەشە دوو ڕۆژی دیکە بەیاننامەیەک بڵاوبکەنەوە و داوای لێبوردنتان لێ بکەن و بڵێن: بەداخەوە نیو کیلۆ تی ئێن تییەکە بۆ بانقەکە دانرابۆوە و بەهەڵە کەوتبووە ناو بازاڕەکەوە. یان لەوانەیە، وەک عادەتیان پێوە گرتووە: بانگاشەی ئەوە بکەن کە حکوومەت خۆی دایناوەتەوە بۆئەوەی سومعەی «پێشمەرگە» ببات!

ئەی جەماوەری خۆشەویست و بەشەرەفی ئەم شارە!

خەڵک بیات!

جوامێر زۆر حەزی دەکرد بچێ سەرێکیش لە ئەختەر بدات، بەڵام کە تەماشای کاتژمێری کرد: شەش و چل و پێنج دەقیقە بوو. هێشتا خەبەری نەبۆتەوە! جگە لەوەش دەبووایە، لە کاتژمێر حەوتی ڕێکدا بگاتە بەردەمماڵی «سمە لووتە» لە گەڕەکی ئیبراهیم پاشا، لای خەستەخانەی شیرەکە: بۆئەوەی هەر پێنج صەد دانەی بەیاننامەکەیان تەسلیم بکات و بەزووترین کات بگەڕێتەوە شاخ!



ئەم تاوانە خوێناوییەی ئەمڕۆ، وەک سەدان تاوانی دیکە، وەک مۆرێک بەسەر نێوچەوانی ئەو تیرۆریست و تێکدەرانەوە دەمێنێتەوە.

کەواتە با دەرس وەربگرین و فێر ببین: هەتا پێمان دەکرێ، پێویستە لەدژی ئەو چەکدارە بەکرێگیراوانە بوەستین، لەناویان ببەین، ئەگەر هەواڵێکمان بیستن خەبەریان لێ بدەین و تەسلیمی هێزەکانی ئەمن و پۆلیسیان بکەین بۆئەوەی بدرێنە دادگا.

دووبارە سەرەخۆشیتان لێدەکەمەوە و بە ناوی حزبی سەروەرمانەوە بەڵێنتان دەدەینێ کە بۆ لەناوبردنی ئەم تاقمە بەکرێگیراوە دژ بە گەلە، هەمیشە لەڕیزی پێشەوەدا دەوەستین و ڕۆژێک هەر

دادێ کە شار لە ئاسەواری ئەم تیرۆریست و یاخیبووە دژ بە میللەتانە پاک ببێتەوە!

بژی حزبی سەروەرمان، حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، بە سەرۆکایەتیی هەڤاڵی تێکۆشەر، صەدام حسێن، خوا بیپارێزێ!



## ژیانی ڕۆژانەی مولازم تەحسین (٢)

مولازم تەحسین، نیوەڕۆ، لەماڵی حاجی مەولوودی بازرگان دەعوەت کرابوو. حاجی مەولوودی بازرگان پێش ئەوەی بچێ بۆ حەج پێیان دەگوت «مەولوود ملیۆنێر»؛ تەنانەت ئێستاش هەر ئەگەر نەتگوتایە «مەولوود ملیۆنێر» کەس نەیدەناسی.

دەعوەتی چی! ڕاستییەکەی، وەک پرسەیەک وابوو. تاقمێک پێشمەرگە، سێ ڕۆژ لەمەوبەر کوڕە گەورەکەی مەولوود ملیۆنێریان ڕفاندبووە شاخ؛ هەواڵیشیان بۆی ناردبوو: « تا پەنجا هەزار دینار بۆ هێزی پێشمەرگەی شاخ نەنێریت، ئێمە کوڕەکەت

## ژیانی شەوانەی جوامێر (٢)

جاری پێشوو پێی گوتم:

– کە دێی سەرم لێ بدەی، خۆزگە پێشتر ئاگادارت دەکردمەوە؛ نەک ئاوها لەناکاو نیوەشەوان خۆت بەماڵەکەدا بکەی!

– بۆچی؟

– بۆئەوەی بەدرێژایی ڕۆژەکە بۆ خۆم تێر تێر بنووم و شەو لەگەڵت وەنەوز نەمباتەوە!

بە سوعبەتەوە پێم گوت:

– ئەدی چۆن ئێمەومانان جاری وا هەیە دوو شەو و دوو ڕۆژ بەم شاخەوە خەو ناچێتە چاومانەوە؟

لەژێر برژانگە درێژە قەترانییەکانەوە، وەک ئەوەی

نادەینەوە!».

کوڕەکەی مەولوود ملیۆنێر، تەمەن نۆزەدە ساڵ، تازە لە بەشی ئەندازیاریی کارەبا، لە زانکۆی سلێمانی، پۆلی یەکەمی تەواوکردبوو. ماوەیەکیش پێش ئێستا، لەگەڵ دایک و باوک و برا و خوشکەکانی، چووبوون بۆ کۆشکی سەرکردایەتیی «سەرۆکی فەرماندە» لە بەغدا: بۆ بەخشینی هەشتا هەزار دینار بە حکوومەتی بەعس لەپێناو پاڵپشتیکردنی بەعس و «قادسیەی صەدام».

مولازم تەحسین بۆ ماوەی سێ کاتژمێر و نیو لەگەڵ مەولوود ملیۆنێر دانیشتن؛ گفتوگۆیان کرد لەپێناو تۆژینەوە لە مەسەلەی چۆنیەتیی ڕفاندنی سالاری کوڕی و چۆنیەتیی وەدەستهێنانەوەی.

هەست بە پەشیمانی بکا لەو قسەیەی کردی، گوتی:

– ئێوە جیاوازن؛ پێشمەرگەن.

– بۆچی جیاوازین؟

– ئافرەت هەموو ئەو شتانەی پێ ناکرێ کە پیاو دەیکا.

پتێکم بەئاستەم، بە خۆشەویستییەوە، لە باریکایی سەری لووتی دا، لاسایی ئەو قسەیەی پێشوویم کردەوە؛ ئنجا گوتم:

– فشەی گەورەش دەکەیت و دەڵێی «دێم لەگەڵت دەبمە پێشمەرگە».

– ئێستاش وا دەڵێم.

پاشان یەکسەر، بەپڕتاو، هەستم بە نەرمایی



مەولوود ملیۆنێر، کە زۆربەی ڕیزە دوکانەکانی ناو (بازاڕی عەصری) و (بازاڕی شووشە) هی ئەون و چەندین کارگەی دیکەی ناو شاری بەناون؛ جگە لەوەش سەهمێکی گەورەی لە هێنان و دابەشکردنی دار و ئاسندا هەیە و بۆ خۆیشی کۆمپانیایەکی گەورەی بازرگانیکردنی گشتی بەڕێوە دەبات؛ لە بەردەم مولازم تەحسین، وەک شێری بریندار دەیناڵاند و هاوری دەکرد:

– گەورەم، ئاخر لەبەر ئەمەیە دەوڵەمەندی کورد پڕۆژە خزمەتگوزارییەکانی خۆی، هەمووی دەخاتە حللە و حەبانیە و دیوانیە و دەرەوەی کوردستان! ئەمە لەبەرئەوەی ئەم سەگ و سواڵانەی ناویان لە خۆیان ناوە «پێشمەرگە» و «نیشتیمانپەروەر» ئەمن

دەستەکانی کرد؛ هەر دوو دەستمی گرت:

– جوامێر، گوتت دووایە پێت دەڵێم. دەی، پێم بڵێ: بڕیاری مەکتەبی سیاسی چی بوو؟

لەسەرەتادا خۆم لە گoورە برد:

– لەبارەی چی؟

– ئایا مەکتەبی سیاسیی حزب ڕازییە من و تۆ زەواج بکەین و وەک ژن و مێردێک بچینە شاخ؟

دەستی ئەختەرم، لەناو هەر دوو دەستی خۆم، لەسەر دڵم دانا، پێم گوت:

– ئەختەر گیان، من سەفەری پێشووم کە هاتمە لات، بەڵێنی تەواوتم دایە کە لە هەموو حاڵەتێکدا هەر دەتخوازم؛ بەڵام باشتر وایە بەشێوەیەکی ئاوها بێت کە جەماعەتی خۆشمان پەسەندی بکەن و ڕازی

و ئاسایشی ئەم وڵاتەیان تێکداوە؛ تاقمێک دز و
جەردەن و ڕاوەڕووت دەکەن؛ ئاوها کە دەیبینی: بە
نوێژی نیوەڕۆ و بەئاشکرا تەعەددا لە خەڵکی
دەوڵەمەند و خاوەن پرۆژەکان دەکەن و ناهێڵن ئەم
وڵاتە ئاوەدانی بە خۆیەوە ببینێت و پێش بکەوێ!
دزن! ئەمانە دزن!

مولازم تەحسین، کاتێ گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی،
لە نزیک ئەمنە سوورەکە لە گەڕەکی عەقاری؛
دەتگوت لە جەنگێکی پیسدا دۆڕاندوویەتی!
هەستی بە تێکشکانێکی گەورە دەکرد! هێشتا
جارێ هەر لەناو ئوتوومبیلەکەی بوو، قەرەوێتەکەی
خۆی شل کردبۆوە و چاکەتەکەی فڕێ دابووە سەر
کۆشی خۆی. گومانی پێ ناوێ؛ ڕاستە! دەمێک بوو

بن. هیچ نەبێ بۆئەوەی کاتێ لەگەڵ خۆم دەتبەم،
ئەوان جێگە و ڕێگەیەکمان بدەنێ تێیدا بژین! تۆ
خۆشت دەزانی، ژیانی ژن و مێردایەتی لەناو شاخ و
داخدا و بە پێشمەرگایەتی.. دۆزەخە!

– ئەرێ وەڵا، سەد خۆزگەم بە ژیانی دۆم و
قەرەج.

– هەر هەفتەیەک لە گوندێک، هەر مانگێک لە
ناوچەیەک. حاڵی حازر لە هەموو ئەو ناوچەیەی
ئێمە تەنیا حاکم بێوار ژنەکەی خۆی لەگەڵیایەتی،
ئەویش خۆت دەزانی: چونکە ئەندامێکی گەورەی
سەرکردایەتیی حزبە!

– یەعنی ڕێگە نادەن پێشمەرگەیەک ژنەکەی
خۆی لەگەڵ خۆی بهێنێ؟



بۆ خۆیشی کەوتبووە ئەم گومانەوە. ئەوەتا ئێستا
بۆی وەدیار کەوت. مسۆگەر ئەم گومانەی مەولوود
ملیۆنێر ڕاستە!

مولازم تەحسین تەواو گەیشتبووە یەقین کە ئەو
قسانەی مەولوود ملیۆنیر دەیلێ؛ ڕاستن. نەء:
گومانی ناوێ. هەمان دۆسیە کۆنەکەیەتی و
بەردەوامە. هەر چی ئەوانەی لەناو دۆسیە کۆنەکەیدا
نووسراون، ڕاستن. ئەوەتا، ئێستا زۆر بەڕوونی
دەرکەوت. بۆ زیاتریش ئەرخایەن بوون وا باشترە
هەر ئێستا بچێتە دایەرە و تەماشایەکی دۆسیە
کۆنەکەی بکاتەوە. بەڵام، باشە، دووای ئەوە! چی
بکا؟ مرۆڤ لەنێوان عەشق و پیشەکەیدا کامەیان
هەڵبژێرێت؟ لەنێوان خۆشەویستی و ئەرکی حیزبیدا

– تا ڕادەیەک هەقیشیانە، ئەختەر.

– لەبەرئەوەی لەو حاڵەتەدا ئەو ژنە دەبێتە بار
بەسەریانەوە، وانیە؟ دەبێ مەسرەفی بکەن؟

– جگە لەوەش، ژن تەحەممولی هەمیشە
ماڵگواستنەوە و بارکردن و ئەم گوند و ئەو گوند
ناکات. لەناکاو سۆسیالیست هێرش دەکەنە سەرت،
یان حکوومەت لەناکاو بە هەلیکۆپتەر ناچارت دەکا
باربکەی! لە شەڕەکەی «قڕتاقە» و «پشت ئاشان»
چونکە ژن و ئافرەتەکان، وەک پیاو گورج و گۆڵ
نەبوون؛ زۆربەی قوربانییەکان ژن بوون. هەرچی
ئافرەت بوون، یان کوژران یان بەدیل گیران.

ئەختەر، تروسکایی چاوەکانی خەریک بوو
بکوژێتەوە:

کامەیان لەپێش ئەوەی دیکەیان دابنێ؟! چۆن باوەڕ بکات کە تا ئێستا فریودراوە؟ چۆن باوەڕ بکات کە تا ئێستا بەردەوام ئەو پردێک بووە و بەسەریدا پەڕیونەتەوە؟ چۆن؟ ناشێ! قەت باوەڕ ناکا! چونکە ئەو لەم هەموو خۆشەویستییەی زۆر دڵنیایە! بەڵام خۆ کورد...

مولازم تەحسین بە هەر دوو دەستی، دەم و چاوی خۆی شاردەوە؛ بەڵام تووڕە؛ حەزی دەکرد لە پڕمەی گریان بدا. لەناکاو، وەک شێرێکی تووڕە، هەڵسایەوە؛ هاواری کردە شوفێر و یاوەرەکانی:

– خۆتان ئامادە کەن؛ دەڕۆمە دەرەوە!

– ئێستا وەڵامیان چی بوو، جوامێر؛ پێم بڵێ!

لە وەڵامدا گوتم:

– ئەختەر گیان، من جاری پێشوو، هەرکە گەڕامەوە شاخ، داخوازینامەیەکم پێشکەش بە مەکتەبی سیاسی کرد و داوام لێیان کرد کە دەمەوێ تۆ لەگەڵ خۆم بهێنمە ژیانی پێشمەرگایەتی!

– ئەنجام؟!

– هێشتا جارێ هیچ کۆبوونەوەیەکیان نەکردووە. هەرکە کۆبوونەوەیان کرد، بڕیارێک لەبارەی ئەم کێشەیەی ئێمەش دەدەن.



## ژیانی ڕۆژانەی مولازم تەحسین (٣)

ناو: ئاراس بابەکر عەبدولحەمید

عەشیرەت: بەرزنجی

ساڵ و شوێنی لەدایکبوون: ١٩٥٤– سلێمانی، گەڕەکی دەرگەزێن

دووایین قوتابخانەی ناوەندی یان ئامادەیی لێوە دەرچووە: ئامادەیی پێشڕەوی کوڕان، نزیک نادی المهندسین.

ساڵی چەند: ١٩٧٤

بڕوانامەی بەرز: بەکالۆریۆس لە کۆلێژی کشتوکاڵ، زانکۆی بەغدا.

ساڵی چەند: ١٩٧٩

## ژیانی شەوانەی جوامێر (٣)

دڵنیام ئەم جارەشیان، دیسان، هەمان دەمەقاڵێ لەنێوانماندا پەیدا دەبێ. ئەم جارەشیان، دیسان، هەرکە دەگەمە ناوحەوشەکە، یەکسەر، لەناو حەوشەکە، یەخەی وەڵامم دەگرێ.

چی بکەم؟ چی پێ بڵێم؟ چۆن دڵم دێ ڕێک و ڕەوان پێی بڵێم:

– ئەختەر گیان، من تۆم بەقەد بیلبیلەکانی چاوی خۆم خۆش دەوێت، تۆ نیوەی دڵ و گیانی منیت، بەڵام لەبەرئەوەی ئێستا هەموو سلێمانی تۆ بە «سۆزانی» دەناسن؛ ڕاستییەکەی، من ناتوانم تۆ بکەمە ژنی خۆم! چۆن دەتوانم دیسان پێی بڵێم:

پایە و شوێنی کارکردنی ئێستای: مودیری بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵ و ئاودێری.
براکانی: پایەدار، ئارام، ئاوات.
خوشکەکانی: حەسیبە، خوناو.
ئەو شوێنانەی کە زۆر هاتوچۆیان دەکات: نادی المهندسین، چایخانەی شەعب، کتێبخانەی سلێمانی، مصور ڕەفیق.
خولیاکانی: خوێندنەوەی کتێب و موتابەعەکردنی هەواڵی سیاسی. خۆ سەرقاڵ کردن بە جیهازی ورد و بچووکی وەکو ڕادیۆ و لاسکی و ئەم شتانە.
ئینتیمای سیاسی: بەعسی.
لە کەیەوە: لە پۆلی دووەمی کۆلێژی کشتوکاڵەوە، ئەو کاتەی قوتابی زانکۆ بووە لە بەغدا.

جارێ چاوەڕێ بە! چۆن جەسارەت بکەم پێی بڵێم: هەڵەی خۆشم بوو، دەبووایە زووتر فریات بکەوم؛ دەبووایە هەر لە ئەووەڵەوە، کە کردتم بە ژن، لەگەڵ خۆمدا بتبەم.
چۆن بتوانم ئاوها ڕاستەوخۆ، بێ پێچ و پەنا ئەم قسانەی پێ بڵێم؟ دڵنیام یەکسەر دەبووریتەوە. دەبووریتەوە. هیچ دووریش نیە، دووای من، وەک دەیان ئافرەتی بێچارە و نسکۆداری دیکەی ئەم شارە، گڕ بداتە گیانی خۆی و ببێت بە زووخاڵ! ئۆف.. خوایەکا.. ویژدانم چەنێک ئازارم دەدات! من ئیتر تا هەتایە چۆن بتوانم باز بەسەر ئەم تاوانە گەورەیەی خۆمدا بدەم؟ ئەی جەسارەت و کەرامەت و وەفا؛ من باشتر وایە ببمە تنۆکێک فرمێسک و



چالاکییە حزبییەکانی: گەنجێکی زۆر چالاک و بەرچاوە. جێگەی متمانەیە و وەفاداریش دیارە بۆ حیزب. لە زۆربەی چالاکییەکانی یەکێتیی قوتابییاندا، کاتی خۆی، ڕۆڵی دیاری هەبووە.
پلەی حیزبی: رفیق متقدم.
برادەرەکانی: زۆربەی ئەو نووسەر و هونەرمەندانەی بەرهەڵستکاری حیزبمانن برادەری ئەون و هاتوچۆیان دەکات، لە نادییەکاندا زۆر جاران لەگەڵیشیان دەخواتەوە.
ئەم خاڵەشیان دیسان جێگەی گومانە: ئایا بەعسییەکی رەفیق حیزبی چ کار و پەیوەندییەکی بەم توێژە بەرهەڵستکارەی حزبمانەوە هەیە؟ ئەمە لەکاتێکدا ئەو ڕاپۆرتانەی لەبارەی ئەو نووسەر و

دابڕژێمە ناخی زەوی! ئەفسووس! ئەم هەموو کتێب و ڕۆشنبیری و تیۆرییانەی لەبارەی مەرگەساتی ئافرەتی بەستەزمان خوێندمنەوە، ئەم هەموو بەزەیی هاتنەوە و باوەڕهەبوونە بە ژێردەستەیی و مافی ئافرەت.. کەچی هێزی ئەوەم پێ نابەخشن جەسارەت بکەم خۆشەویسترین ئافرەتی ژیانم ڕزگار بکەم! ئەم هەموو بانگاشە و ئیدیعا مارکسی و ڕۆشنفیکرانەیەم کوانێن؟ بۆچی لەبەردەم سادەترین پەنجە بۆ درێژکردنی خەڵکدا هێزیان دەپووکێتەوە و «تەنانەت سەرشۆڕ» ناتوانن سەریش هەڵبڕن؟! ئاخ! کتێب و تیۆر و ڕۆشنبیری.. لەوە دەچێ، لە درۆیەکی گەورە زیاتر، هیچی دیکە نەبن! ئەی ویژدان! ویژدانیشم، هیچ گوڕ و بڕستێکی تێدا

هونەرمەندانەشەوە نووسیونی، وە شتێکی ئەوتۆ
نین!
تێبینیی گشتی:
١) بایەخدانێکی لەڕادەبەدەری هەیە بە کتێب و
ڕۆشنبیریی مارکسی. ئەم دیاردەیە جێگەی لێ
وردبوونەوەیە! گەنجێکی بەعسی بۆچی هێندە بایەخ
بە مارکسیەت دەدا؟ ئایا لەپێناو ئەوەیە بەڕاستی
دوژمنەکانمان بناسێت، یان تەنیا بۆئەوەیە خۆی
ڕۆشنبیر بکات؟
٢) کاتێ قوتابی بووە لە بەغدا، لە بەغداوە
بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی.
سەفەر زۆر دەکات، تەنانەت دەڕوا بۆ هەولێر و
دهۆک و زۆریش لە کەرکووک دەمێنێتەوە. هاوڕێی

نەماوە. دەبووایە هیچ نەبێ ویژدان هەندێ جەسارەتم
بداتێ. خۆ ویژدان هەمیشە ئازارمان دەکا! بەڵام من
ماندووم، هەستی بێ ماڵی و بێ دەرەتانی و
ئاوارەیی، هەمیشە بەم شاخ و داخانەوە، گیان و
ڕۆح و دڵ و بیرمی پرزۆڵ پرزۆڵ کردووە. بەڕاستی،
پێشمەرگە مرۆڤێکی ئاسایی نیە و ژیانێکی
ئاساییانەش بەسەر نابات. ئێمەی پێشمەرگە،
بەڕاستی، بووینەتە کۆمەڵێک ئاژەڵی سەرەتایی ناو
ئەم شاخ و داخە بێ کەڵکانە. ئۆف!
- تۆ ئەگەر بمخوازیت و بمبەی لەگەڵ خۆت، من
ئیتر بەیەکجاری لەدەست ئەم ڕیسواییەی ئێرە
ڕزگارم دەبێ!
- من لێرە ڕزامەوە، تولاّمەوە هێندەی خەفەت



کچ و ژنی زۆرە. پێمان وابێ ئەم قەرەباڵغییە زۆرە
لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ژنان، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی
کە مێبازە. ئەگینا، پێویستە لەباری سیاسییەوە،
گومانی لێ بکرێت!
٣) لە ساڵی ١٩٨٥، دووای ئەوەی چوار ساڵ
بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵی لەدەستدا بوو، دەرکەوت
خەت مایلە و لەپێناو پێشمەرگە بەکرێگیراوەکان
کاردەکات. تا ئێستا نەشزانراوە لە چ ساڵێکەوە
بەنهێنی بۆ ئەو تاقمە بەکرێگیراوە کاری کردووە؛
ناشزانین چ زانیاری و نهێنی و شتێکی دیکەی
حزب و حکوومەتمانی گەیاندۆتە پێشمەرگە؟! تەنیا
ئەوەندە نەبێ - کە دەیزانین- کاتێ پەیوەندیی بە
پێشمەرگەوە کردووە، سەرجەم پارە و پوول و

بەوە بخۆم کە خەڵک پێم بڵێن: «جوامێر تەنیا
دەستی بە ئەختەر گەرم کردەوە و پاشان بەجێی
هێشت!».
- هەر لەسەر تۆ بوو دایکە کلۆڵەکەم لە خەفەتان
سەری نایەوە؛ خاڵۆکانم حاشایان لێکردم؛ باوک و
براشم ئەگەر هەبووان سەریان دەبڕیم. من لەسەر تۆ،
بێزەوەرترین و نەفرەتلێکراوترین ژنی دنیام.
- هەر لەپێناو تۆ و حزبدا، وەک پەڵەگۆشتێکی
بۆگەنکردووم بەسەرهات و ئێستاش دەمبینی: کرم
تێم کەوتوون! ڕزگارم کە!
- من لەسەر ئەمری تۆ و ئەمری حزب نەبووایە،
چۆن کەڕامەتم قبووڵی دەکرد گورگێکی ئینسانخۆری
وەک مولازم تەحسین ددان لە سنگ و مەمکم گیر

مومتەلەکاتی بەڕێوەبەرایەتییەکەی لەگەڵ خۆی ڕفاندووە کە بە دوو صەد هەزار دینارێک تەخمین کراوە.

٤) لەو وەختەوەی پەیوەندیی بە پێشمەرگەوە کردووە، ناوی خۆی گۆڕیوە و نازناوێکی بۆ خۆی داناوە. تکایە، لەبەرئەوەی ئەم خوێڕییە پیاوێکی خائینی زۆر ترسناکە؛ پێویستە زانیاریی زیاتری لەبارە پەیدا بکرێت و نازناوەکەیشی بدۆزرێتەوە!

مولازم تەحسین، سەرلەنوێ، سەری لە مەولوود ملیۆنێر دابۆوە؛ چارەگە سەعاتێکی دیکە لەگەڵی دانیشتبوو. لێی پرسیبوو:

– ئەو جوامێرەی باسی دەکەیت و گومانت وایە بکات؟

جوامێر ئەم قسانەی ئەختەری دەهاتەوە یاد، لە هەمان کاتدا ئەو قسانەیشی وەبیر خۆی دەهێنایەوە کە جارێکیان لە کاتی تووڕەییدا پێی گوت:

– تۆ لەدووای ڕۆشتنی من، هەزار و یەک عەلاقەت لەگەڵ هەزار و یەک پیاوی خوێڕیی ئەم شارەدا پەیدا کرد.

– تۆ لەدووای ڕۆشتنی من؛ چیت دەدایە من، هەمان شتیشت دەدایە پیاوانی دیکە. تۆ بێ وەفایت!

– من و حزب پێش ئەوەی داوات لێبکەین ببیت بە جاسووس بەسەر مولازم تەحسینەوە، تۆ خۆت دەمێک بوو دەستت دابووە قەحپەیی و بێ شەرەفی!



ئەو کوڕەکەتی ڕفاندبێ؛ ئەم (ئاراس بابەکر عبدالحمید)ە نیە؟

– بەڵێ، خۆیەتی! ئەمەش وێنەکەیەتی! من دوو سێ جاران، ئەوکاتەی مودیری بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵ بوو، بینیبووم. ئەو خوێڕییە یەک دونیا ئەجهیزە و پارەی حکوومەتیشی دزی ئنجا ڕووی کردە شاخ.

مولازم تەحسین دیسان پرسیاری لە مەولوود ملیۆنێر کردەوە:

– یەعنی، ئەو جوامێرەی تۆ باسیت کرد و خەڵکیش باسی دەکەن کە شەوان دادەبەزێتە ناو شار؛ هەمان ئەم ئاراسەیە، کە مودیری بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵ بوو؟

ئاخ، جوامێر، تۆ چۆن دڵی هات ئەم هەموو قسە ناشیرینانە بەم فریشتە بێتاوان و جوانە بڵێیت؟ ئەختەر، وا بۆ سێ ساڵ زیاتر دەچێ، دەزگیرانیەتی، هاوڕێییەتی، ژنیەتی، هاوحزبیەتی، خەمخۆریەتی، سەرشۆریەتی، جلشۆریەتی، تەنانەت لەجیاتی خوشک و دایک و هەموو کەسیەتی! چۆن دڵی هات؟ ئاخ! چۆن دڵی بێت لێی جودا ببێتەوە؟

– ئەدی بیخوازێ؟

– ئازاترین ئەو پێشمەرگانەی بە شەو و ڕۆژ دادەبەزنە ناو سلێمانی! جوامێری پاڵەوان کە بۆتە «ئەفسانەیەک» و هەموو سلێمانی شانازیی پێوە دەکات؛ بچێ «ئەختەری قادر قوتوو» بخوازێ؟.

جوامێر، سەفەری پێشوو، کە لای ئەختەر بوو،

– بەڵێ. بەڵێ. هەموو دنیا ئەمە دەزانێ. کاتێ
چووە شـــاخ و بووە جـــەردە، ناوی لە خـــۆی نا
«جوامێر».
– سوپاس!

مـولازم تەحـسین، وەک فـیشـەکـە شـێـتـە، بۆی
دەرچوو.

جەسارەتی کرد لە ئەختەر بپرسێت:
– ئەختەر، بەڕاستی پێم بڵێ: چیی نوێ لەنێوان
تۆ و مولازم تەحسیندا هەیە؟
ئەختەر، یەکسەڵەف، بێ بیرکردنەوە دانی پێدا
نا:
– مولازم تەحسین داخوازیی دەستم دەکا؛ دەیەوێ
بمخوازێ.
جـوامـێـر، هەسـتی بە غـیـرە و لە هەمـان کـاتدا
کـەمـێک ئیـهـانە کـرد لەوەی کـە ئەخـتـەر بەو
ڕاسـتگۆیی و بێ مننەتی و ڕاشکاوییـەوە وەڵامی
دایەوە. گوتی:
– درۆ دەکەی.
ئەختەر، بێ مننەت، کەمێک نیگەران، زۆرتریش



دڵشکاو، گوتی:
– باش! .. درۆ دەکەم.
جوامێر بە لاقرتییەوە گوتی:
– دەتەوێ من غیرە بکەم و زووتر مارەت بکەم!
– تەواو، جـوامـێـر! چیـتـر بیـر لەم مـەوزووعـە
مـەکـەرەوە! ئەگـەر جـارێکی دیکە بینیت من داوات
لێ بکەم بمخوازیت؛ هەقت بێ! تەواو، من جارێکی
دیکە داوای هیچت لێ ناکەمەوە تا ئەوکاتەی خۆت
دەگەیتە باوەڕ و بڕیارێک.
– مـولازم تەحـسین گـەیشـتـۆتە باوەڕ و بڕیاری
خۆی. ها؟!
– نەخێر، درۆم کرد.
– ئەدی ئەوکاتە چی وەڵامی حزب دەدەیتەوە؟!

ئەختەر تێگەیشت کە ئەم قسەیەی جوامێر لە شێلگیری و غیرە و باوەڕێکی ڕاستەقینەوە سەرچاوەی گرتووە؛ تووڕە بوو:

– ئێستا من گوتوومە «ڕازیم و شووی پێ دەکەم» ؟ ؛ عەریزەم نووسیوە بۆ مولازم تەحسین «ئەرێ مولازم تەحسین وەرە بمخوازە» ؟! غەیر ئەم بەڵایەش ئێوە تووشتان کردم! تۆ و حزب! ئێوە خۆتان داواتان لێ نەکردم... ؟!

جوامێر کە ئەم هەڵچوون و تووڕەبوونە کانگاییەی ئەختەری بینی، خەریک بوو باوەڕ بەوە بێنێ کە ڕاستە: مولازم تەحسین دەیەوێ بیخوازێت. دەشبێ. بۆ نا ؟ گوتی:

– بەڕاستی، ئەختەر؛ مولازم تەحسین هاتۆتە



داخوازیت؟

– ئەم ڕاستییەم لە ڕاپۆرتەکەی ئەمڕۆش نووسیوە کە دامناوە بتدەمێ و بیبەی بۆ مەکتەبی نهێنییەکانی حزب.

– بەڕاستتە ؟

– بەڵێ. داوام لێ کردوون: وەڵامم چی بێت بۆ مولازم تەحسین؟ چی بکەم؟ پێویستە بەزووترین کات وەڵامم بدەنەوە، چونکە من لە هەڵوێستێکی ناخۆش و حاڵەتێکی قورسدام. جگە لەمانەش، ئەمە جۆرە ئیحراج بوونێکە بۆ من.

– یەعنی، تۆ بەڕاستیتە، ئەختەر! مولازم تەحسین هاتۆتە داخوازیت؟

– باش نیە ئەو دەشیەتە داخوازیم! ؟

جوامێر، لەبەر تالووکەیی و غیرە، نەیتوانی لەو
تانەیەی ئەختەر تێبگات، بەپەلەپڕووزێ گوتی:

– ئەدی بۆچی تۆ پێشتر ئاگادارت
نەکردوومەتەوە؟

– ئەوە نیە پێت دەڵێم و باوەڕ ناکەی؟

جوامێر بە ئەختەری گوت:

– من لە زیرەکیی تۆ تێدەگەم!

– چیە؟

– تۆ دەتەوێ ئەم مەسەلەیەی داخوازیکردنی
مولازم تەحسین بکەیتە هەنجەتێک بۆئەوەی شار
بەجێ بێڵیت و بەگەڵ من بکەویت! لەوکاتەشدا،
مەکتەبی سیاسی ناچار بکەیت کە من و تۆ وەک ژن
و مێردێک لە شاخ قبووڵ بکەن. ئافەرین!



– ئەمە درۆ و نەخشەدانان نیە، واقیعی حاڵەکە
ئاوهایە. ئایا تۆ بۆ خۆت، یان حزب، بەوە ڕازی
دەبن من درۆ لەگەڵ حزب و نیشتیمان بکەم و شوو
بە مولازم تەحسین بکەم؟ ویژدانتان قبووڵ دەکات
من بکەومە چڵپاوی خیانەتەوە؟

ئەختەر ئێستا لە ماڵەوە بەتەنیایە. لەوانەیە
خەریکی جلچنین بێ. دەزانێ کاتێ من دەگەمە لای:
لە شاخەوە هاتووم و هیلاکم، چڵکنم، برسیمە. کە
دەگەمە حەوشە، یەکسەر دەچێ حەمامەکەم بۆ گەرم
دەکات و چێشتەکەم بۆ دەخاتە سەر ئاگر. پاشانیش
دێتەوە، بەپەلەپەل، پەلامار دەداتە یەخە و بەرۆکم:
کورتەک و شەڵوار و قەمصەڵە و فانیلە و تەنانەت
دەرپێ قوتەکەشم لەبەر دادەکەنێت و کراس و

پێجامەیەکی خەتخەتی خاوێنم دەداتە دەست و دەڵێ: «دژوێنن، دەچم فڕێیان دەدەمە غەسسالەکەوە». لە هەموویشی خۆشتر عەرەقە فەلە حەیاتەکەم قەت لەبیر ناکا. پێم دەڵێ:

– بەڵام حەزدەکەم دووای نانخواردن بیخۆیتەوە.

– نابێ.

– با.

پێدەکەنم دەڵێم:

– بۆ ئەوەتە کاتی ڕاکشان گەرمتر ببم؟

– نەء.

– ئەدی چی؟

– چونکە عارەق بۆنی دەڕوا؛ دەر و دراوسێ بۆن دەکەن کە لێرەیت.



ئەم گەڕەکەی ئەوان، یەکە یەکە، جوامێر دەناسن. هەموویان یان خزمن، یان ئاشنا و ناسیاو، یان لایەنگر و دۆستی حزب.

– گەورە و بچووک خوا خوایانە، شەوێک، لە پەنا دیوارێک، لەکۆڵانێک چاویان پێت کەوێ: کلاشنکۆفت بەسەر شانەوە.. بۆئەوەی سبەینێ، بە ڕۆژ، بۆ یەکتری بگێڕنەوە بڵێن: دوێنێ شەو پێشمەرگەمان بینی! جوامێر! جوامێرمان بینی! کلاشنکۆفێک بە شانەوە.. مەڕحەبایشی لێکردین! کێ هەیە لە سلێمانی خۆی بە قوربانی جوامێر نەکا؟ سلێمانی چەند جوامێری هەیە؟

جوامێری پێشمەرگەی هەموو شەو دابەزیوی ناو شار؛ بۆتە ئەفسانە! جوامێر ڕەمزی بەرگریی

نیشتیمانی و هێزی ڕزگارکردنی کوردستانە! لە
سای جوامێرەوە، خەڵک دەیانگوت: سلێمانی بە
ڕۆژ بەدەست حکوومەتەوەیە، بە شەویش بەدەست
پێشمەرگەوە!
جوامێر کاتێ کەوتە سەر شەقامەکە، لە دوورەوە
تەماشای ئەوبەری کرد، دیتی: بەردەرکی کۆڵانەکەی
لای حەمام نالی – کە بەرەو ماڵی ئەختەر دەچێ –
پیکابێکی درێژی پڕ لە جەیشی شەعبی و قووات
خاصەی لێ ڕاوەستابوو. باش بوو، زوو بینینی.
یەکسەر کشایەوە ناو کۆڵانە تەنگەبەرەکەی لێوە
هاتبوو؛ کۆڵانە و کۆڵان، تا گەیشتە ناو
قەبرستانەکە؛ لەوێشەوە خۆی گەیاندە لای
سەموونخانەکەی ئەوسەری کۆڵانەکەی ماڵی



ئەختەر.
لەو دەمەدا، جوامێر ئەو ساتە سەختەی ئەو ڕۆژەی
بیر هاتەوە کە نیو کیلۆ تی ئێن تییەکەی پێ بوو
بۆئەوەی بیگەیەنێتە ئەختەر و ئەویش بیسپێرێتە
«مچەی مەنیج» بۆئەوەی نیوەڕۆی ڕۆژی جومعە –
کە دەوام نیە و خەڵکی تێدا نیە- بانقە
حکوومییەکەی شار بتەقێننەوە! بەڕاستی، ئەو ڕۆژە
دەترسا! هیچ نەبێ لەوەی لەدەست خۆیدا بتەقێتەوە!
دەی، با ئەم شەویش هەر بە هەمان کۆڵانی
تەنیشت سەموونخانەکەوە بڕوا. ئەو ناوە لەوە دەچێ
ئەهوەنتر و چۆڵتر بێ، لەبەرئەوەی هیچ
دامودەزگایەکی حکوومەتی لێ نیە. چەکەکەی لەژێر
پاڵتۆکەیدا دەشارێتەوە و تێپەڕ دەبێ. لەناو ئەم

تاریکییەدا گەر بیشیبینن، خەڵک هەر وا دەزانن بەدمەستێکی تەڕوەنەیە و درەنگ دەگەڕێتەوە لانەکەی خۆی. ئەم شارە خۆ پڕە لە عارەقخۆر و سەرسەری و لانەواز و تەڕوەنەی بێباک کە نیوەشەوان، ئەم کاتانە، لە بارِ و یانەکاندا بەسەرخۆشی دەگەڕێنەوە...

جوامێر کە گەیشتە سەری کۆڵانەکە، هەنگاوی بە لەزتر کرد: دەیزانی ئەختەر، لەسەر ئاو و ئاگر، چاوەڕێی وەڵامیەتی...!



## ژیانی ڕۆژانەی مولازم تەحسین (٤)

ئەختەر، ئەو نیوەڕۆیە، سەروپێیەکی زۆر بەتامی لێ نابوو. گوتی:

– تەحسین، هەندێکت بۆ بێنم.

– بەم عەسرە هیچم بۆ ناخورێت، بۆم هەڵیبگرە پاش ئێوارە.

ئەختەر بە هیچ شێوەیەک نەیتوانی هیچ ئاسەوارێکی تووڕەیی و شڵەژان و نائارامی لەسەر دەموچاوی مولازم تەحسین بخوێنێتەوە؛ ئەمەش لە نازیرەکی و ناهەستیاریی ئەختەرەوە نەهاتبوو؛ بەڵکو لە توانا و کارامەیی مولازم تەحسینەوە بوو کە نەیهێشت تەنانەت تۆزقاڵێکیش چیە شڵەژان و

## ژیانی شەوانەی جوامێر (٤)

– چۆن دڵم بێ؟ چی پێ بڵێم؟ چۆن دەست پێ بکەم؟ ئەمە پلانێکە و بۆ پەپوولەیەک دەنرێتەوە! ئەمە سێدارەیەکە و بۆ دڵم هەڵخراوە! چۆن دەمی قسەم هەڵبهێنم..!؟

– ها، جوامێر؟! ئەم ورتە ورتە چیە لەبەرخۆتەوە؟

– گەیشتیتە چی لەگەڵ مولازم تەحسین؟

– مولازم تەحسینی چی، جوامێر؟ من بڕیاری تۆ و حزبم مەبەستە.

– گوێ بگرە، ئەختەر، بەڕاشکاوی و بەوپەڕی ڕوونی و ڕاستگۆییەوە پێت دەڵێم: ئەوە سێ ڕۆژ

پەشۆکاویی پێوە دیار بێت. بەتەواوەتی کۆنترۆڵی هەست و نەست و سۆزی گرتێبەربووی خۆی کردبوو!

هەردووکیان لە بەر سێبەری خۆشی ناو چیمەنەکە، لەژێر دارگوێزە نەوی و قژ بڵاوەکەدا، لەسەر دوو کورسی، بەرامبەر یەکتر دانیشتبوون. ئەختەر، پێشتر، هەندێک دەنکە باوی و گوێزی لەبەردەم مولازم تەحسین دانا:

– دەزانم حەزت لێیەتی.

چاوەڕێی ئەوە بوو چایەکە دێم بدا:

– ئەرێ تەحسین، باش بوو ئاوا لەناکاو هاتی! دوێنێ ئێوارە، ژنانی گەڕەک باسیان دەکرد: لە کاتژمێر هەشتی ئێوارەوە تا نیوەشەو، کوڕێکی گەنجی گەڕەکی مەجیدبەگتان بەبەر چاوی گەڕەکەوە

زیاترە، هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی حزب بەم مەسەلەیەی من و تۆ و مولازم تەحسینەوە مەژغوولن.

– بڕیاری چیان دا، جوامێر؟

– من ئەم شەو هاتووم لە نهێنی و پڕۆژەیەکی زۆر گرنگ ئاگادارت بکەمەوە!

– دەی!

جوامێر هەستی دەکرد خۆی بۆ کوودەتایەک ئامادە دەکات؛ ئەختەریش هەناسەی بەتەواوەتی لێ بڕابوو. جوامێر دووای کۆخەیەک، دەنگی نزمتر کردەوە:

– ئەختەر گیان، ئێمە، هەردووکمان، ئەرکێکی مێژوویی گەورەمان لەسەر شانە.

– چی؟



داوەتە بەر ڕێژنەی گوللە و هەلاهەلاتان کردووە، پاشانیش بە چامرلغی مسەللەحەیەک بەستووتتانەتەوە؛ گەڕەکاوگەڕەک بەناو یەکە یەکەی شەقامەکاندا سووڕاندووتانە: پۆئەوەی هەموو کەسێک لاشەی کوژراوی ئەو کوڕە گەنجە بەستەزمانە ببینێت، لەبەرئەوەی «پێشمەرگە» بووە! ئەمە کارێکی زۆر بێزەوەنە تەحسین! من دڵنیام بە فەرمانی تۆ نەکراوە.

– با. بە فەرمانی من کراوە و بەردەوام لە بڵندگۆی مسەللەحەکەشەوە هاوارمان دەکرد:

– ئەمەیە چارەنووسی هەر کەسێکی بەکرێگیراو کە تی ئێن تی بۆ خەڵکی بێگوناهی ئەم شارە بنێتەوە! تۆ ناو لەم کوڕە گەنجە دەنێی

– پێویست وایە مولازم تەحسین لەکۆڵ ئەم شارە بکەینەوە!

– چۆن؟

– مەکتەبی سیاسیی حزب بڕیاری داوە کە بە پلانێکی پێشمەرگانەی ورد و سەرکەوتوو، بە هاوکاری و دەوری سەرەکیی تۆ؛ مولازم تەحسین بڕفێنینە شاخ!

– چیی لێ بکەین؟

– بیرفێنین. بیبەینە شاخ!

– ئەمە بڕیاری مەکتەبی سیاسییە؟

– بڕیاری مەکتەبی سیاسییە.

– چۆن؟

– پلانەکەمان داڕشتووە و ئامادەیە. هەر لەم

«بەستەزمان»! دەزانی ئەم کوڕە کێ بوو؟
– کێ بوو؟
– ئەو کەسە بوو کە نیو کیلۆ تی ئێن تییەکەی لەناو مەیدانی ماستەکەدا تەقاندبۆوە؛ نۆزدە کەسی کوشتبوو، سی و حەوت کەسیشی بریندار کردبوو.
ئەختەر دەیزانی: ئەو کوڕە گەنجەی گەڕەکی مەجید بەگ، کە یەکێک بوو لە فیدابییەکانی ناوخۆی شار، لەجیاتی ئەوەی نیو کیلۆ تی ئێن تییەکە لە پەنادیوارێکی بانقە حکومییەدا دابنێتەوە؛ چووبوو لەناو عارەبانەی شێلمفرۆشێکدا کە لە بەردەم بانقەکە وەستابوو، داینابۆوە.. پاشان کابرای شێلمفرۆش عارەبانەکەی هەورازتر دەبات و دەچێ لەناو مەیدانی ماستەکە ڕادەوەستێ؛ ئیتر لەوێ

ڕۆژانەدا دەتوانین بۆسەیەکی، هەر لێرە، بۆ دابنێینەوە و قۆڵبەستی بکەین؛ لەگەڵ خۆمان بەرەو شاخ بیپێچینەوە.
– حزب بە چ ئامانجێک ئەم بڕیارەی داوە؟ لەپێناو چی؟
– وەک ڕەهینێک دەیبەین. دەتوانین بە لای کەمییەوە دەیان کادری خۆمان و پێشمەرگەی زیندانکراوی ناو بەندیخانەکانی بەعسی پێ بەر بدەین! لە هەمان کاتدا دەتوانین وەک ڕەهینێک بەرامبەر بە حکوومەت بەکاری بهێنین بۆ هێنانەدیی هەندێک لە ئامانجە سیاسییەکانی حزب.
ئەختەر هەرگیز لە ژیانیدا ئاوها نەکەوتبووە تالووکە و نائارامی؛ لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمە



دەتەقێتەوە! ئەو شەوە، ئەختەر بە جوامێریشی گوت:
– وەیش..! جەرگم بوو بە ئاو!
مولازم تەحسین دەستی لەسەر ئەژنۆی ئەختەر دانا:
– ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە؟
ئەختەر ڕاچەنی:
– هیچ.
– چایەکت دێمی دا.. هەستە!
ئەختەر کە هاتەوە، گوتی:
– بە کارەساتی تەقینەوەی مەیدانی ماستەکە بەڕاستی جەرگبڕ بووم! بیرم لەوە دەکردەوە.
– تەنیا جەرگبڕ بوویت؟

دووایین وەرەقەیە کە لە دەستی ئەوان و لە دەستی منیشدا ماوە!»؛ «دەتوانم لە بەرژەوەندیی خۆمدا بەکاری بێنم». بە جوامێری نەگوت:
– باشە، بەڵام بە مەرجێک مەکتەبی سیاسیی حزب ڕازی ببێت کە تۆ من بخوازیت و بەیەکەوە بتوانین لە شاخ بژین!
بە جوامێری گوت:
– باشە، جوامێر؛ مەکتەبی سیاسیی حزب، دووای جێبەجێکردنی ئەم پلانەی ئێمە؛ ڕازی دەبێت تۆ من بخوازیت و بەیەکەوە بچینە شاخ؟
جوامێر، کە لەناوبردنی مولازم تەحسینی بەلاوە لەپێشتر و گرنگتر بوو، نەیویست دیسان ئەختەر بخاتە گومان و پشێوییەوە؛ بێ دڵ لە دڵ دان،

- چی؟!
- دەڵێم: کاتێ بیستت نیو کیلۆ تی ئێن تییەکە تەقیوەتەوە، تەنیا هەستت بە جەرگبڕیی کرد؟
- مەبەستت چیە، تەحسین؟
- کەمێک.. کەمێک.. کەمێک هەستت بە تاوانباریش نەکرد؟

ئەختەر بەم تانووتەی مولازم تەحسین لە جێگەی خۆی وشک بوو. هەر دەبووایە بەم ڕۆژەی وەک ئەمڕۆ بگات؛ ئەوەتا «کەشف» بوو! باشتر! تەماشای ئەنگوستیلە زێڕە گەورە بریقەدارەکانی پەنجەی خۆی دەکرد و هەڵیدەگلۆفین؛ ئەو ئەنگوستیلە بەهادارانەی مولازم تەحسین بۆی کڕیبوون. گوتی:

گوتی:
- ئەختەر.. تەواو.. دەتبەم.. لەگەڵ خۆم دەتبەمە شاخ.. تا هەتایە پێکەوە دەژین!



- تاوانی چی، تەحسین؟

مولازم تەحسین چایەکەی بەردەم خۆی تێکدەدا. تەقەتەقی تێکدانی چایەکە دەنگێکی ترسناک و بەسامی لەناو مێشکی ئەختەردا دروستکردبوو. مولازم تەحسین گوتی:
- گوێ بگرە، ئەختەر!

ئەختەر نەیدەتوانی تەماشای چاوی مولازم تەحسین بکا:
- بەڵێ.
- من چەند مانگێکە دەتناسم.. ئەمە یەکەمین جارە دەمەوێ «هەندێ پرسیاری ڕەسمی» لە تۆ بکەم. ئیزنم دەدەی، ئەختەر گیان؟
- پرسیاری چۆن؟

- تۆ پیاوێک دەناسی بە ناوی «جوامێر» ؟

ئەختەر، بێ سڵەمینەوە، گوتی:

- بەڵێ.

- ئەدی پیاوێکی دیکە بە ناوی (ئاراس بابەکر عبدالحمید) ؟

- ئەویش دەناسم؛ بەڵام هەردووکیان هەمان کەسن.

- «جوامێر» نازناوی حیزبیەتی؛ وا نیە؟

- وایە.

- ئەو جوامێرە هەمان ئەو جوامێرە نیە کە خەڵک دەڵێن شەوان دادەبەزێتە ناو شار و تەخریبات دەکا و خەڵک دەکوژێ و «تی ئێن تی دادەنێتەوە ناو عارەبانەی شێلمفرۆشان» ؟



- با.

-ئەو جوامێرە هەمان ئەو ئاراس بابەکر عبدالحمیدەش نیە کە چەند ساڵێک پێش ئێستا مودیری بەڕێوەبەرایەتیی کشتوکاڵ بوو ؟

- با.

- کە دەزگیرانی تۆش بوو؛ خۆشی دەویستی و پەیوەندیشتان هەبوو!

ئەختەر، بۆئەوەی مولازم تەحسین زۆرتر باوەڕی پێ بکا، دانی پێدا نا:

- ئێستاش خۆشی دەوێم و پەیوەندیمان هەیە!

مولازم تەحسین دەستی نەکردەوە زللەیەک بسرەوێنێتە بناگوێی ئەختەر و بڵێ «ئەدی بۆچی تا ئێستا ئەم شتانەت لێ شاردوومەتەوە؟»؛ دەشیزانی

چاوەکانی ئەختەر هێندە گەش و پاک و ڕوونن هیچ درۆ و ناپاکی و خیانەتێکیان تێدا ناشاردرێتەوە؛ ئەختەری بۆ لای خۆی ڕاکێشا. ئەختەر لە سەرەتادا ترسا، بەڵام کاتێ مولازم تەحسین لاجانگی ماچ کرد؛ هێور بۆوە.

مولازم تەحسین هەناسەیەکی ئۆخەی دا و لێی پرسی:

– تۆ بۆچی درۆم لەگەڵ ناکەی، ئەختەر؟

ئەختەر پێش ئەوەی بداتە پرمەی گریان، گوتی:

– ئەدی بۆچی تۆش بە شەق ناکەویتە سەرم و نامبەیتە ئەمنە سوورەکە و گوللەبارانم بکەن؟

مولازم تەحسین ئەختەری لە باوەش خۆی کردەوە:

– ئەختەر! سێ مانگ زۆر کەمە بۆئەوەی من



بەتەواوەتی بتناسم؛ بەڵام من هەست دەکەم نەک سێ مانگ بەڵکو سی ساڵە دەتناسم.

مولازم تەحسین، لەناکاو، هەر دوو قۆڵە پڕ و نەرمەکانی ئەختەری گرت:

– ئەختەر، حەزدەکەم ئەم شەو بێیتە لام بۆ ماڵەوە.

– ناتوانم.

– باشە، من دێمە ئێرە بۆ لات.

– ئەم شەو نا.

مولازم تەحسین پتێکی لە لووتی دا:

– نایەمە داخوازیت، مەترسە! هەندێ قسەی پێویست هەیە پێت دەڵێم.

– ئەم شەو ناتوانم.

– بۆچی؟
–جوامێر دێته لام.
– جوامێر ! «جوامێری پاڵەوان» ؟
– بەڵێ.



## ژیانی ڕۆژانەی مولازم تەحسین (٥)

ئەختەر، لە ماڵی مولازم تەحسین، لە ژووری نوستن، لەسەر سیسەمێکی شاهانەدا، لە ناوجێ، بە ڕووتی لەگەڵ مولازم تەحسین ڕاکشابوو.

– من هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو کە ئاراس بابەکری کۆنە بەڕێوەبەری زراعە، هەمان ئە جوامێرەی ئەمڕۆ بێت.

ئەختەر گوتی:

– تۆ ئەگەر ئەمەت بزانیایە هەرگیز منت خۆش نەدەویست.

– بۆچی واتێدەگەی؟

– چونکە ئەوکاتە تۆ واتدەزانی کە من بۆ

## ژیانی شەوانەی جوامێر (٥)

ئەختەر، بە جوامێری گوت:

– جوامێر ئەم شەو خەونێکم پێتەوە دیوە. زۆر دەترسم.

– لە چی؟

– لەوەی کە مەکتەبی سیاسیی حزب فریوی تۆ و فریوی منیش بدەن!

– چۆن؟

– مولازم تەحسینمان پێ ئاودیوی شاخ بکەن و دووایەش پوولێکمان پێوە بنێن: نەهێڵن ببینە ژن و مێردی یەکتر و بچینە شاخ!؟

– ئنجا ئەمە کەی گیروگرفتە؟

جاسووسی کردن لەگەڵ تۆم! بۆیەش، من لە خۆمەوە، پێم نەدەگوتی.. تا خۆت پرسیارت لێکردم. هەر چۆنێک بێ، تەحسین، تەواو، هەرچی لە کەشکۆڵی مندا هەبوو هەڵمڕشت. من ئەمڕۆ داڕزام هێندەی قسەت بۆ بکەم. ئۆف، تەحسین، هەرگیز لە ژیانمدا بەقەد ئەم چەند ڕۆژەی دووایی هەستم بە ماندوویی و بێزەوەریی خۆم نەکردووە. من زۆر ماندووم..

– ئێستا؛ تەواو؟! تۆبە دەکەی؟ واز لە جاسووسی کردن دێنیت بەسەرمەوە؟

مولازم تەحسین، لە خوارەوە، پڕ بە ناوچنگ، ئەختەری لەناو دەستی خۆی کۆکردبۆوە و توند دەیگوشی؛ ددانیشی بەپێکەنینەوە جیڕ کردبۆوە:

–چیتر ڕاپۆرتم لەسەر نانووسیت و بۆیان بنێری؟

– ئاخر ئەوکاتە لەناو شاریش، حەتمەن، کەشف دەبین و بە دەردی کەشف بوونەکەی «خولەی عەلی خان» دەسگیر دەکرێین و لە بەردەرکی سەرا گوللەباران دەکرێین!

– نەخێر؛ کەشف نابین. لەوە مەترسە.

– پلانەکە کێ و کێی تێدایە؟

– خۆم و خۆت و دووازدە پێشمەرگەی تر، چوار ئوتوومبیلمان لەگەڵدایە، هەر هەمووشیان چەکی قورسیان پێیە. بەڵام بۆسەیەکی ئەوتۆیە، دڵنیابە: یەک گوللەیشی تێدا ناتەقێ! بە نوستوویی لە ماڵەکەی ئێوەی، لێرەی دەبەینە دەرەوە! تۆ هەوڵبدە سەرخۆشیشی بکەیت ئنجا خەوی لێ بکەوێ! دووایە بۆسە و پلانەکەت بەفراوانی بۆ باس دەکەم.



ئەختەر هاواری کرد:

– حەیوان.. بەرمدە! دێشی.

مولازم تەحسین لەشی ئەختەری بەردا، گوتی:

– تۆش ئاواهی ڕۆحی منت گرتووە!

– تۆڵەی خۆت ئاوها لێم مەکەوە.

– ئەدی چۆن؟

– بمخوازە.

– هەر ئێستا دەنێرم مەلا بێت و لەیەکترمان مارە بکەن!

– نەء، ئێستا نا.

مولازم تەحسین، ڕووی لە ئەختەر کرد:

– بەڵام با منیش، پێشوەخت، دان بە هەندێ شتدا بنێم لەبەردەم تۆدا.

– دەترسم، جوامێر!

– تۆ هیچ مەکە! تەنیا لەگەڵی بە.. تا ئەوکاتەی خەوی لێدەکەوێ.

– من تێناگەم: مارەبڕینی من و تۆ چ پەیوەندییەکی بە مەکتەبی سیاسیی حزبەوە هەیە؟

– ئەختەر، بڕایەوە! من بەڵێنم پێتداوە: ئەگەر حزبیش ڕازی نەبێت؛ ئەمە گرفتی شەخسیی خۆمە: من هەر مارەت دەکەم و پێکەوە دەژین. تەواو، من بەڵێنم پێت داوە!

– جوامێر؛ من ئەم شەو خەونێکم پێتەوە دیوە. دەترسم.

– خەونی چی بوو؟

– لە خەومدا تۆ لەمبەری جۆگەیەک بووی، منیش

مولازم تەحسین، ڕووت، پشتی کردە سەرینی سیسەمەکە، ئەختەری ڕووتی سپی و سۆڵی، وەک کەروێشکێکی گەورەی نەشمیل، هەڵگرت؛ خستییە سەر کۆشی خۆی: قاچی ڕاست و چەپی ئەختەری، بەملا و بەولای لاکەلەکی ڕاست و چەپی خۆیدا شۆڕکردەوە، گوتی:

–بۆئەوەی ڕانەکەیت لەدەستم.

ئنجا گوتی:

– من ژنم هێناوە و دوو منداڵم هەن.

– پێت گوتووم.

– ژنەکەم مردووە. منداڵەکانیشم لە بەغدا لە ماڵی دایکم دەژین. منداڵەکانم، کچ و کوڕێکن.. هەردووکیان لە قۆناغی سەرەتایین. تۆ ئامادەی

لەوبەری جۆگەکە بووم؛ دەمانویست باوەش بەیەکتردا بکەین؛ نەماندەتوانی: مارێکی ڕەشی ئەستوور، لەنێوانماندا، لەناو جۆگەکە، لەسەر کلک هەستابۆوە... خوایەکا!

– ئەو مارە مولازم تەحسینە.

– ئاخر؛ مارەکە بۆ لای تۆ نەدەهات؛ ڕووی هەر لە من بوو.. منیش هاواری تۆم دەکرد: «جوامێر! ڕزگارم کە!».. تۆ سڕ ببوویت و گاڵتەت پێم دەکرد.. دەتگوت: «مەترسە، پێتەوە نادا».

– شەوی جومعە لەسەر شەموو، دەعوەتی لای خۆتی بکە!

– پاشان لەناکاو، تۆ شێوەی مارەوانێکی کارامەت وەرگرت.



بەخێویان بکەی، ئەختەر؟

– وەک منداڵی خۆم بەخێویان دەکەم.

مولازم تەحسین، بە پەنجەتووتەی، چەناگەی ئەختەری بەرزکردەوە:

– بۆ دووایین جاریش، دیسان، پێت دەڵێمەوە، ئەختەر: ئەگەریش هەست دەکەی بەوە ئیحراج بوویتە کە من بە میانەی تۆ و جوامێرم زانیوە؛ یان ئەگەر بەڵێنت داوەتە جوامێر و بڕیارت داوە شوو بە ئەو بکەیت؛ بەڵێنی پیاوان بێت: دەست لە هیچ کامتان نادەم؛ بڕۆ شوو بە ئەو بکە و پیرۆزی یەکتر بن! بەڵێنت پێ دەدەم: تا دەشتگوازێتەوە و دەتباتە شاخ.. من لێرە نەمێنم.. بە ئیجازەیەک دەگەڕێمەوە بەغدا.

– وەک هەموو جارێکی دیکە...

– دەتگوت بەدرێژایی ژیانت هەر مارت بەخێوکردووە؛ لەگەڵ مارەکە قسەتان دەکرد و سەماتان دەکرد. مارەکەش هەر لە من نزیکتر دەکەوتەوە..

– هیچ نەترسیت. جاران چۆن بووی لەگەڵی؛ هەر ئاوها بە! بەڵام لەبیرت نەچێ: پێویستە بیخەوێنیت..!

– جوامێر توخوا گوێت لە من بێ: تۆ لە خەونەکەمدا ببوویتە مارەوان، قسەت لەگەڵی دەکرد و سەمات لەگەڵی دەکرد؛ پاشان چووی سەری مارەکەت گرت..

– ئەختەر گوێ بگرە: ئەو مارە مولازم تەحسینە.

ئەختەر لە کانگایەوە هەستی کرد هیچ کەسێک لە ژیانیدا نەبووە هێندەی مولازم تەحسین خۆشی بوێت؛ گریا:

– تەحسین، تۆ زیاد لە پێویست منت خۆش دەوێ.

مولازم تەحسین، شەیدا، لە چاوە گەشە سیحراوییەکانی ئەختەر ورد بۆوە:

– تۆ لەوە دەچێ بە کەسێکی زۆر نزیکم بچیت، یان لەوانەیە لەتێکی ڕۆحم بیت. لە من بوویتە مەرەقێک، تەنانەت هەندێ جار هەستدەکەم «کێشەیەک».

– کێشە؟

مولازم تەحسین پێکەنی:

با زوو خۆمانی لێ ڕزگار بکەین! شەوی جومعە لەسەر شەموو، وەک جاران دەعوەتی بکە!

– من حەزدەکەم لەگەڵ تۆ بم، لەگەڵ تۆ بژیم. با عەقد زەواج لەنێوانمان نەبێ، قەیناکە. با تەنیا بەو شاخەوە پێکەوە بین. من شانازی بەمەوە دەکەم لەگەڵ تۆ پێشمەرگە بم.

– شەوی جومعە لەسەر شەموو دەیبەین و دەڕۆین..

– من لێرە، لە «قەحپەیەک» زیاتر، هیچی دیکە نیم. تەنیا لەگەڵ تۆ و لەناو شاخدا شەرەفی خۆم دەکڕمەوە.

– کاتژمێر سێ و نیوی شەو، لە گەرمەی خەودا، دەیپێچینەوە و دەیبەین؛ دەڕۆین؛ نەجاتمان دەبێ.



– ئەدی ئەوە نیە لەگەڵ جوامێر شەڕمانە لەسەر تۆ؟

ئەختەریش پێکەنی. پاشان مولازم تەحسین گوتی:

– بەڵام ئەگەر جوامێر بەڕاستی تۆی خۆش بویستایە، خۆ ئەو چەندین ساڵە تۆی کردۆتە ژن و پشتی تێکردووی. بۆچی تا ئێستا نەیخواستووی و ئاتبا لەگەڵ خۆی؟!

– ئەو ترسنۆکە؛ ڕاستگۆش نیە لەگەڵ خۆی و خۆشەویستیی من.

مولازم تەحسین، دەستی بۆ پاکەت و جگەرەکەی درێژکرد:

– ئەختەر گیان، ئیتر من لە ئەمڕۆوە خۆم بۆ ئەوە

– کەواتە من ناوماڵ و کەلوپەلەکانم بفرۆشم؟

– ها ؟ بۆچی؟

– ئەدی پاش ئەوە، من ئەگەر لەگەڵ تۆ بە شاخ بکەوم و بشزانن کە پێشمەرگە بە هۆی منەوە مولازم تەحسینیان ڕفاندووە؛ دێن ماڵەکەم تەخت و تالان دەکەن!

– بە ڕای من: جارێ هیچی ماڵەکەت نەفرۆشیت.

– بۆ؟

– ئەدی لەکوێ بۆسەکەی بۆ دابنێینەوە؟

– ئەدی کە من لەگەڵ ئێوە بەرەو شاخ بەڕێ دەکەوم، ئەم ماڵ و حاڵە ئاوها بەجێ بێڵم؟

– کەواتە، جارێ تۆ لەگەڵ ئێمە نەیەیت، باشترە!

ئاماده دەکەم کە ببینە ژن و مێردی یەک.

ئەختەر بە ئاسوودەیی و دڵخۆشیی شاژنێک پەنجەکانی دەستی بەناو تووکە فرفرییەکانی سەر سنگی مولازم تەحسین دەگێڕا:

– تەحسین، دەمبەیتە بەغدا؟

– وەک کاتی خۆیشی پێم دەگوتی: دەبێ دەمودەست بچینە بەغدا، ئێرە بەجێ دێڵین.

ئەختەر گوتی:

–باشە؛ بۆچی؟

پاشان هەر بۆ خۆی بە سوعبەتەوە پێکەنی:

– سومعەی هیچ یەکێکمان لێرە تەواو نیە.

مولازم تەحسین، بە هەمان ئاوازی لاقرتییەوە:

– سومعەی «جوامێر» زۆر تەواوە!

ئەختەر وەک منداڵێک کڕووزایەوە:

– ئەدی کەینێ بێم؟

– کە ئەومان گەیاند؛ خۆم ئاگادارت دەکەمەوە.

ئەختەر، تارایەکی غەمگین و نائومێدی، دیسان کەوتەوە سەر ڕوخساری. چاوەکانی، هێندە ڕوون و گەش و پاک بوون، هیچ ترس و گومانێکی تێدا نەدەشاردرایەوە. لەترسان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو. ڕۆحی دەلەرزی؛ خۆی بە جوامێرەوە نووساندبوو:

– جوامێر گیان، دەترسم...



ئەختەر گوتی:

– با ئەم شاخ و تەڕاشانە بۆ ئەو بن و...

– ئەتۆش بۆ من.

مولازم تەحسین و ئەختەر، هەردووکیان ڕووت، وەک دوو ماری عاشقە و ماشقە، لەناوەڕاستی ژووری نوستنەکە، بەپێوە، لە قەدی یەکتر ئاڵابوون و دەستیان لەسەر ڕوومەتی ئەوی دیکەیان، ئینج بە ئینجی دەمی یەکتریان ماچ دەکرد. لەناکاو، ئەختەر بە مولازم تەحسینی گوت:

– تەحسین، سبەینێ جومعەیە.

– ئێ؟

– تۆ هەموو شەوێکی جومعە لەسەر شەموو،

دەعوەتی منیت..
- کفتەی سابوونکەرانیم بۆ دەکەی؟
- سبەینێ.
- دێی؟
- ئەدی چۆن؛ بۆ نایەم؟
- دەبێ شەو لەلام بشمێنیتەوە.
مولازم تەحسین پێکەنی، بە شۆخییەوە گوتی:
- .. مەلایەکیش لەگەڵ خۆم دێنم.

- ڕەعنا! ئەو شەوە، شەوی دووشەممە بەسەر سێ شەممە بوو،کاتژمێر دوو و نیو لایدابوو؛ من هەستامەوە - عەیب نەبێ- میز بە «سۆران» بکەم.. لە سەربانی ماڵی خۆمانەوە، بە ڕێککەوت ئاوڕێکی حەوشەی ماڵی ئەختەرم دایەوە، دیتم: ئەختەر، بەو شەوە درەنگە ئەنگوستە چاوە، بە کراسێکی شۆڕی سپییەوە، دەتگوت خێوێکە، قژکراوەی بژ، نیگەران، لەناو حەوشەکە، بەدرێژایی ڕێگای نێوان ژووری دەستەڕاست و دەستەچەپ، شڵەژاو، دەتگوت ڕاوی دەنێن.. پیاسەی دەکرد! دیاربوو چاوەڕێی کەسێکی دەکرد. ئەیەڕۆ! خەریک بوو بانگی بکەم، بڵێم:

- ئەختەر ئەوە چیتە، شێت بووی؟

دووایە لە دڵی خۆمدا گوتم: لەوانەیە چاوەڕێی جوامێر بکات سەری لێ بدا! دەنگیشم بدایە، هەموو دەر و دراوسێ خەبەریان دەبۆوە. چووم نوستمەوە.

پاشان، من لەناوجێ بووم، ئەیەڕۆ؛ گوێم لە پستە پستێکی زۆر سەیر بوو، دەتگوت دەگری و دەلاڵێتەوە یان دەیەوێ کەسێک بخنکێنێ و ناتوانێ. ترسام. ویستم مامەند خەبەر بکەمەوە، پاشان گوتم: نا.. با بۆ خۆم بزانم چیە؟ دەمزانی پستەپستەکە لە حەوشەی ماڵی ئەختەرەوە دێت! هەستام دوور بەدوور، لە سەر دیواری سەربانەکەمانەوە گوێم هەڵخست. بەتەواوەتی ئەرخایین بووم کە دەنگی ئەختەرە. ملم بەناو حەوشەکەیاندا شۆڕکردە خوارەوە، دیتم ئەختەر لەناو حەوشەکە ڕاوەستابوو، پشتی لە من، ڕووی لە حەمامەکەیان، بە پستە پست، بە عەرەبی، قسەی



دەکرد. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەیەڕۆ، ئەوە ئەختەر بە عەرەبی قسە لەگەڵ کێ دەکا بەم شەو درەنگە! پاشان یەکسەر تێگەیشتم، گوتم: ئەوە دیسان مولازم تەحسینی لەلایە! باوەڕم پێ بکە، ڕەعنا، وەک چۆن ئێستا گوێم لە تۆیە، ئاوها گوێم لە ئەوانیش بوو قسەیان دەکرد. شەو بوو، دنیا کش و مات، تەنیا دەنگی ئەوان دەهات. مولازم تەحسین، دیار بوو بەتووڕەییەوە پێی دەگوت:

- بچۆ حەوشەکە، ئاگات لە دەرگای دەرەوە بێ!

ئەختەریش دەیگوت:

- دەترسم بەسەر دیوارەکەمانەوە بێتە ژوورەوە!

-کۆڵان سەرتاپا بۆسەی تێدا دانراوەتەوە، مەترسە! مولازم تەحسین گوتی.

- ئاخر دەترسم ببێتە تەقە و بقڵیشێتەوە.

ئنجا مولازم تەحسین دەنگی بەرزتر کردەوە:

- ئەدی تۆ نالێی بەتەنیا دێت؟! پاشان من پێم گوتوون.. بە هیچ شێوەیەک تەقەی لێ نەکەن؛ لێی گەڕێن بێتە ژوورەوە. دە بڕۆ.. تۆ ئاگاداری دەرگای حەوشە بە!

ڕەعنا!

خۆ من گەلێک شەوی دیکە بە دەنگی لە دەرگادانی جوامێر یان مولازم تەحسین، لەناو جێ خەبەرم بۆتەوە! بەڵام ئەم جارەیان زۆر سەیر بوو! نەمدەتوانی حەزنەکەم بزانم ئەو شەوە ئاخۆ چیی دیکە ڕوو دەدا!

لەسەر دیوارەکەمانەوە، کە تەماشای ئەوبەرم کرد، وەیش.. زەندەقم چوو! ژوورەکەی دەستەچەپی ماڵی ئەختەر، ئەها ئەو ژوورەی کەللەی مامزە

عەنتیکەکەی لێیە؟ پڕ بوو لە عەسکەری چەکدار.. چی پێ دەڵێن؟ قووات خاصە. شەش حەوتێک دەبوون: بە کلاشنکۆف و ئارِ پی جییەوە، هەندێکیان وەستاو، ئەوانی دیکە لەسەر چینچکان. خوایە، چی قەوماوە؟ لە دڵی خۆمدا گوتم. تۆ بڵێی ئەم هەموو موشتەرییە بە جارێک لە ئەختەر هاتبێتنە ژوورەوە؟ من چوزانم بۆسەیان بۆ جوامێر داناوەتەوە؟! پاشان دیتم: لەملا، سێ چەکداری دیکەش، لەلای ئاودەسخانەکەوە ڕاوەستابوون، تەنیا دەست و کلاشنکۆفەکانیان لە منەوە دیاربوون. وەلحاصڵ دیار بوو ماڵی ئەختەر پڕ ببوو لە چەکدار و قووات خاصە! من هێشتا نەمدەزانی ئەمە بۆسەیە. هەر دەترسام شتێک لە ئەختەر قەومابێ! پاشان کە دیتم: ئەختەر ئاماژەی بۆ چەکدارەکان دەکرد و بەپستەپست قسەی لەگەڵیان دەکرد؛ ئنجا پەنجەی خۆم گەست و تێگەیشتم؛ گوتم: هەبێ و نەبێ بۆسەیان بۆ جوامێر داناوەتەوە.. ئەگینا مولازم تەحسین و ئەو هەموو قووات خاصەیە بەیەکەوە لە ماڵی ئەختەر بەم نیوە شەوە چی دەکەن؟! سەرم دانەواندە خوارەوە و گوتم: با نەمبینن. گەڕامەوە ناوجێ. بە مامەندم گوت:

– هەستە! هەستە مامەند!

مامەند گوتی: چیە؟

گوتم: هەستە! ماڵی ئەختەر پڕ بووە لە قووات خاصە؟

مامەند گوتی:

– هەبێ و نەبێ، مەزبەتەی لێکراوە.

– مەزبەتەی چی و حاڵی چی! پێم گوت.

مامەند دەیویست بە دەرپێی غودبەوە بچێتە سەر



دیوار و ملی خۆی بەناو ماڵی ئەختەردا شۆڕبکاتەوە. گوتم:

– نەچی! دەتبینن. نەوەک تەقەت لێ بکەن! پڕە لە قووات خاصە.

مامەند هەر چوو. تەماشایەکی کرد و هاتەوە. گوتی:

– چۆڵ و هۆڵە. قووات خاصەی چی؟ ئەوە تۆ شێت بووی؟

من کەوتمە گومانەوە. دیسان چووم تەماشایەکی ناو حەوشەکەم کرد، دیتم: ڕاستە: چۆڵ و خامۆش...

بە مامەندم گوت:

– خۆیان لە ژوورەوە مات داوە.

مامەند گوتی:

– بێ عەقڵ، خەونت دیوە.

گوتم:

– نە بەخوا. بە چاوی خۆم بینیمن.

– دە واز بێنە کارت پێیانەوە چیە؟ بنوو! مامەند گوتی.

ڕەعنا، خەوم لێ نەدەکەوتەوە. دەمزانی شتێک ئەم شەو هەر دەقەومێ. ها؟ ئا. ئا. ئەختەر هەر لەوێ بوو. نەڕۆیشبوو؛ بەڵام ئەویش لەگەڵ ئەوان خۆی مەڵاس دابوو: هەموویان چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە جوامێر لە دەرگا بدات و ئەختەر بچێ دەرگای لێ بکاتەوە.

لەناکاو، گوتم:

– مامەند هەستە! دەرگایە!

مامەند ڕاچڵەکی، گوتی:

– دەرگای ئێمە؟

گوتم:

– دەرگای ئێمەی چی، هەشبەسەر!

مامەند ڕەپێ بۆوە، گوتی:

– ڕاست دەکەی منیش گوێم لە زەنگی دەرگایەک بوو.

مامەند بە دەرپێی غودبەوە، من بە کراسی ناوجێوە، هێشتا خەواڵوو، چووین پێکەوە ملمان بەسەر دیواری سەربانەکەمانەوە بەرەو ماڵی ئەختەر شۆڕکردە خوارەوە: بزانین کێیە لە دەرگای ماڵی ئەختەر دەدا؟

ئەختەرمان بینی دەمودەست کەوتە ناو حەوشەکەوە، وەرسووڕایەوە بچێت دەرگا بکاتەوە. گوێمان لە جیڕەی دەرگاکە بوو؛ کرایەوە. ئێمە لە سەربانەکەی خۆمانەوە هیچمان نەدەدیت، بەڵام دیار بوو کە ئەختەر دەرگای لە کەسێک کردەوە. دڵمان، تەپ، تەپ، لەسەر هەزار لێی دەدا. کێیە؟ چیە؟ چ دەقەومێ؟ هیچ نەبوو. هیچ دەرنەکەوت. مەودای نێوان حەوشە و دەرگای حەوشەکە ئەوەندە نەبوو کە ئەختەر هێندەی پێ بچێ. هەر هیچ دەرنەکەوت. لەناکاو، دەنگی خنکانی کەسێک هاتە گوێمان؛ کەسێک، وەک خەریک بێ بخنکێ، یان، وەک بیەوێ هاوار بکات و نەهێڵن. گڵخە گڵخێک بوو. ئنجا تەپپەیەک، دەنگی لێدانێک: لە دەنگی بەربوونەوەی شووتییەک دەچوو لە شوێنێکی بەرزەوە. بەو دەنگانەی دەمانبیستن، باش دیار بوو، کە ئینسانێک کەوتۆتە بۆسەی چەند چەکدارێکەوە؛ دەمیان گرتووە و بە کلاشنکۆف لە کەللەی سەری دەدەن و دەیبوورێننەوە! پاشان لەناکاو گوێمان لە قیژەیەکی سامناکی ئەختەر بوو! مامەند گوتی:



– وس بە!

من چاوم بڕیبووە ئەو داڵانەی لە حەوشەکەوە دەچۆوە سەر دەرگای دەرەوە. لەناکاو، ئەختەر، پێش هەموو کەسێک بەدیارکەوت: بە ناوەڕاستی حەوشەکەدا ڕایکرد، وەک گوللەیەک، تیژ تێپەڕی؛ دەگریا و بە هەر دوو دەستیشی ناودەمی خۆی گرتبوو. کاتێ گەیشتە لای حەمامەکە، لەترسان هەڵدەلەرزی، قژی خۆی دەڕنییەوە و لە ڕووی خۆی دەدا؛ وەک هەواڵی مردنی خۆشەویستێکی بگەیەنێتە ئازیزێکی، بە دەنگێکی زۆر شڵەژاوی گریاناوییەوە سەری بردە ناو حەمامەکە:

– تەحسین، زووکە! وەرە دەرەوە..!

ئەوکاتە دەنگی خنکانەکە نەمابوو. دیار بوو تەواو دەمکوت کرابوو. ئەختەر، بێدەنگ، بێ ئەوەی بتوانێ بگری، پیشی دەخواردەوە و هەر لە ڕووی خۆی دەدا؛ دەمگوت: ئێستا دەبووریتەوە!

مولازم تەحسین، دەست بە کلاشنکۆفەوە لە حەمامەکە هاتە دەرەوە: بە دەستی ڕاستی، کلاشنکۆفەکەی گرتبوو؛ بە دەستی چەپیشی ئەختەری هەترەشچووی لە باوەش گرتبوو و تەماشای داڵانەکەی دەکرد.

هەر لەو دەمەدا، لای داڵانەکەوە، وردە وردە چەند تارماییەک لە ئێمە وەدیار کەوتن. شەش پیاوی کەڵەگەتی چوارشانەی چەکدار؛ جلکی قووات خاصەیان لەبەر بوو. لە دوورەوە دیار بوون، کلاشنکۆفەکانیان بەدەستەوە گرتبوو. دووانی پشتەوەشیان، هەر یەکەیان، قەمەیەکی دەسک ڕەشی بریسکەداریان بەدەستەوە بوو؛ دەتگوت شیرن دەبریسکێنەوە. دیار بوو، هەموویان، پێشتر، خۆیان

لە لای ناندینەکەی پێشەوەی ماڵی ئەختەر شاردبۆوە و بۆ جوامێر لە بۆسەدا بوون.

کاتێ شەش چەکدارە قووات خاصەکە نزیکتر کەوتنەوە و گەیشتنە ناو حەوشەکە، دیتم: وەیش.. لاشەی جوامێریان هەڵگرتبوو! وردە وردە، بەدیار دەکەوتن و دەهاتنە ناو حەوشەکەوە. بە هەر شەشیان لە لاشەی ئەو جوامێرە نازدارە ئاڵابوون! هەر یەکەیان لایەکی لاشەکەی هەڵگرتبوو: یەکێکیان دەستی، یەکێکیان دەستەکەی دیکەی؛ ئەوەی تریان قاچی، چوارەمیشیان قاچەکەی دیکەی. دوو پیاوە قەمە بەدەستەکانیش - دیار بوو جەللادن - لەدووایانەوە دەڕۆیشتن. هەموویان دەستێکیان بە کلاشنکۆفەوە و دەستەکەی دیکەیان بە لاشەی جوامێرەوە، لاشەی جوامێریان هێنا لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا فڕێیان دا.

ڕەعنا!

هێندەی چاوم دەگێڕا سەری جوامێرم بەدی نەدەکرد. وەی، وەی، وەی، وەی.. چیم دیت! خوایە! سەری جوامێریان بڕیبوو! سەریان بڕیبوو! دیار بوو هەر لەناو داڵانەکە، پێش ئەوەی بگاتە حەوشە، سەریان بڕیبوو! هەی کوێر بم! وەیش! هەی هەناویان بە خوێنی داتەکاو بێ ڕەببی! دەست و قاچی جوامێری نازدار، جوامێری پاڵەوان، بەبێ کەللەی سەر، هەتا ناو حەوشەکە، لەناو دەستی چەپەڵیاندا هەڵواسرابوون. ئۆف. لە چاوان کوێر بم. جوامێر، بەبێ سەر، بەبێ سەر، لە ناوەڕاستی حەوشەکە فڕێ درابوو. ئەختەر! ئەختەر! هەی سەرت بە بڕین چێ ڕەببی؛ کە سەری ئەو پیاوە نازدارەت ئاوها بە بڕین برد! هەی هەناوت بە خوێنی



داتەکاو بێ، ڕەببی، ئەختەر!

مولازم تەحسین ئەختەری سپاردە دەست ئەو یاوەرە چەکدارانەی خۆی، کە پێشتر لە ئاودەسخانەکەدا خۆیان شاردبۆوە. ئەختەریان برد، لەولاوە ڕایانگرت.

ئەختەر هەر دەنووزایەوە و لە ڕووی خۆی دەدا. مولازم تەحسین بۆ خۆیشی، وردە وردە، بە هەنگاوی جەللادێک، کە تینووی خوێنی سەری نێچیرەکەی بێت، لە لاشەی سەرپڕاوی جوامێر نزیک دەکەوتەوە. ئەو چەکدارە زەبەللاحانەی دیکەیش، کە خۆیان لە ژووری نوستن و لە ژووری کەللەمامزە عەنتیکەکەی ئەختەر مەڵاس دابوو؛ لەو دەمەدا - بێ ئەوەی تەنانەت یەک گوللەش چیە بیتەقێنن - هاتبوون دوور دوور بەدیار لاشەی بێ سەری جوامێرەوە ڕاوەستابوون؛ چاوەڕێی فەرمایشتی مولازم تەحسین بوون.

یەکێک لە شەش چەکدارە قووات خاصەکان «ئەوەی قەمە بریسکەدارە خوێناوییەکەی بەدەستەوە بوو» ڕۆیشت بەرەو داڵانەکە. کە گەڕایەوە، کەللەسەری جوامێری بە قژ بەدەستەوە گرتبوو؛ هێنای، لەسەر لاشەکەی جوامێری دانا.

مولازم تەحسین، کاتێ لە تەماشاکردنی سەری بڕاوی جوامێر تێر تێر بوو؛ لاسلکییەکەی دەرهێنا و دەستی کردە تەلەفۆن کردن. پاشان ڕووی کردە یاوەرە چەکدارە قووات خاصەکانی، وتی:

- دەی...

ئنجا پاشان، بە سەری لمۆزی، ئاماژەیەکی بێزاویی بۆ ئەختەریش کرد و بە یاوەرە چەکدارەکانی گوت:

- ئەم قەحپە پیسەش ببەن! لێرەی بەجێ نەهێڵن!
من لە سەر دیواری سەربانەکەمانەوە، خەریک بوو شـێت ببم؛ دیقـەتی ئەخـتـەرم دەدا: ئەخـتـەر، ئابڵـووقـەدراوی ناو چەکـدارەکـان، هەر دەگـریا و بە هەر دوو دەست قژی خۆی دەرنییەوە؛ بەدەم چەمۆڵە لە خۆ نانەوە، دەلالایەوە و لە ڕووی خۆی دەدا:
- وەیش.. وەیش.. وەیش...

ئەخـتـەر لەوە زیاتر نەیدەزانی هیـچی تر بکا و هیچی تر بڵێ..